






# مەحوینامە

پ.د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان

* ناوی کتێب: مەحوینامە

* نووسینی: پ.د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان

* تایپێست و نەخشەسازی:

* چاپ: دووەم

* چاپخانە: چاپخانەی منارە/ هەولێر

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

* نرخ : ٤٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٨٥)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە.

## ( بەناوی خوای دلۆڤان )

# پێشەکی

دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٩٦ نامەی دکتۆراکەم کە بەناونیشانی (شیعری ئاینی و سۆفیگەری لەشیعرە کوردییەکانی مەحویدا) بوو، تەواوکرد، مەحوی بووە بەشێك لەژیانی خوێندەواریم و هەوڵی ئەوەمدا زیاتر بەناخی شیعرەکانیدا رۆبچم و لایەنە شاردراوەکانی دیاربخەم.

بەم پێیە تێزی دکتۆراکەم دوا بەرهەم نەبوو لەسەر مەحوی و هەر ناو بەناو لێکۆڵینەوەیەکی زانستیم لەسەری ئامادە دەکردو لەگۆڤاری زانکۆی سەلاحەدین/ مرۆڤایەتی بڵاوم دەکردەوە و جارو باریش پەلم بۆ دەرەوەی گۆڤاری زانکۆ دەهاوێشت و سوارەیەکی دیکەم دەخستەسەر گەلاوێژی شیعرەکانی مەحوی.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەگۆڤای زانکۆ بڵاوم کردنەوە بریتی بوون لەمانەی خوارەوە:

١ــ شیعرە فارسییەکانی مەحوی لەنێوان چاولێکەری و دووبارەکردنەوەدا، گۆڤاری زانستی مرۆڤایەتیی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، ساڵی چوارەم ژمارە هەشت، یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠.

٢ـ شیعرە فارسییەکانی مەحوی لەڕوانگەی سۆفیگەریەوە، گۆڤاری زانستی مرۆڤایەتیی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، ژمارە (١٢)ی ساڵی ٢٠٠١.

٣ـ کاریگەریی مەحوی لەسەر سەید ئەحمەدی نەقیب و حەمدی دا، گۆڤاری زانستیی مرۆڤایەتیی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، ژمارە (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٢.

٤ـ نامۆیی لە شیعرەکانی مەحویدا، گۆڤاری زانستی مرۆڤایەتیی زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، ژمارە (٣٠)ی ساڵی ٢٠٠٧.

هەروەها ئەم دوو لێکۆڵینەوەیەش هەر لەسەر مەحوین:

1 ـ لەنێوان مەحوی و مەلا محەمەدی خاکیدا، گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ژمارە (٦٤)ی ساڵی ٢٠٠١ی عیسایی.

2ـ لەنێوان دوو غەزەلی شەو و ڕۆژی حەمدی و مەحویدا، مەحوی ـ بەشێك لە بابەتەکانی فیستیڤاڵی مەحوی، ئاراس، ٢٠٠١.

لەبەر ئەوەی هەر چوار لێکۆڵینەوە زانستییەکان تاك و تەرا نەبێ نەکەوتوونەتە بەر دیدی خوێنەرانەوە، چونکە ئەم گۆڤارە لەسنووری زانکۆ دەرناچێ و ناکەوێتە بازاڕەوە، بۆیە وام بەچاك زانی کە ئەم لێکۆڵینەوانە لەچوارچێوەی کتێبێکدا چاپ بکەم و ناوی لێ بنێم (مەحوی نامە)، بەهیوای ئەوەی چاوی عاشقانی مەحوی سورمەڕێژ بکاو دەروونیان پێ بحەسێتەوە.

ئیبراهیم ئەحمەد شوان

# شیعرە فارسییەکانی
# مەحوی
# لە نێوان چاولێکەریی و دووبارە کردنەوەدا

# پێشەکی

تا ئێستا قەڵەم بە دەستێ نکوولّیی لە جیهانی بەرینی شیعرەکانی مەحوی نەکردووە بە تایبەتی شیعرە کوردیەکانی ، لەم رووەوە گەلێ گوتار و لێکۆڵینەوە نووسراون و تەنانەت نامەی دکتۆراشی لە سەر نووسراوە.

ئەوەی جێی سەرنجە شیعرە فارسیەکانی وەکو کەرستەیەکی خاو ماونەتەوە و ئەوەی ئێمە ئاگادارین برشتی نووکی خامەی نووسەرانی پێڕا نەگەیشتووە ، بۆیە وەکو سەرەتایەك ویستمان ئەم دەرگا کلۆم کراوە بکرێتەوە و چەند لایەنێکی شاراوەی بۆ خوێنەران ئاشکرا بکرێت و گەر خوا یار بێت نوسینی تریشی بەدواوە بێت بۆ دەستنیشانکردنی ئاستی هونەری و بە هێزیی ئەم شیعرانە.

لەم لێکۆڵینەویەدا متمانە کراوەتە سەر ئەو دیوانەی کە مەلا عەبدول کەریمی مودەڕیس و محەمەدی کوڕی لێیان کۆڵیوەتەوە.لێکۆڵینەوەکەش بریتیە لە دوو بەشی سەرەکی و ئەنجام و کورتەی باسەکە بە زمانی عەربی و ئینگلیزی و لیستی سەرچاوەکان.

بەشی یەکەم : بریتیە لە بەراوردێ لە نێوان شیعرە فارسیەکانی مەحوی و حافزی شیرازیدا، ئەمەش دەکەوێتە خانەی ئەدەبی بەراوردکارییەوە، ئەم کاریگەریەش بەڵگەی سەلمێنراوی خۆی هەیە و مەحوی لە دیوانەکەی لە چەند شوێنێکدا نیوە بەیتی حافزی وەرگرتووە و لەگەڵ شیعرەکانی خۆی تێهەڵکێشی کردوون.

بەشی دووەم :هەرچەندە لەم بەشەدا بەرهەمی تاکە شاعیرێ بەراورد دەکرێ . بەڵام لەبەر جیاوازیی هەردوو زمانەکە هەروەکو ئەدەبی بەراوردکاری سەیر

دەکرێ . لەم بەشەدا هەوڵ دراوە بەیتە لێکچووەکان بەسەر ئەم بابەتانەی خوارەوە دابەش بکرێ جگە لە کۆمەڵە بەیتێکی هەمەجۆر :

١-مەحوی و سووتانی پەروانە .

٢-دەردی عیشق و داخی سینە .

٣-مەنسووری هەللاج .

٤-کوشتن بە دەستی یار و مردن لە پێناویدا .

٥-مەجنوون و کۆهکەن (فەرهاد) .

٦-یار و مەی و مەیخانە .

٧-بە هیچ نەزانینی جیهان .

٨-چەند بەیتێکی هەمەجۆر .

بەهیوای ئەوەی خشتێکی ترمان خستبێتە سەر دیواری تەلاری ئەدەبی کوردی.

# ( بەشی یەکەم )
# شیعرە فارسییەکانی مەحوی و حافزی شیرازی

مـەحوی یەکێکـە لـەو شـاعیرە کـوردە کلاسـیکانەی کـە کاریگـەریی حـافزی شـیرازیی بەسـەرەوە دیـارە ،لـە نامـەی دکتۆراکـەی (د.ابـراهیم احمـد) شـیعرە کوردییەکانی مەحوی لە گەڵ حـافز بـەراورد کـراوە و کۆمەڵـە بـەیتێکی لێکـچوو دەستنیشانکراون و لە لایەنی رووخسار و ناوەڕۆکەوە لێیان کۆڵدراوەتەوە .

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە لـە سـەر شـیعرە فارسـییەکانی مەحوییـە و بـە پێـی توانـا هەوڵدراوە بەراوردێك لـە نێـوان شـیعرە فارسـیەکانی مـەحوی و حـافزدا ئـەنجام بدرێ ، نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە کاریگـەریی شـیعرەکانی حـافز لـە شـیعرە کوردییەکانی مەحوی بەرچاوترە نەك فارسییەکانی ، هەروەها دەتوانرێ بگوترێ کـە شـیعرە فارسـییەکانی مـەحوی بەگـشتی دووبـارە کردنـەوەی شـیعرە کوردیـەکانێتی ،بـەڵام ئـەو گـەرم و گـوڕی و لایەنـە گیانیـەی لـە کوردیـەکانی هەڵدەقوڵێن وا بە زەقی لە فارسییەکانی بەرچاو ناکەون.

خاڵێك هەیە شایەنی ئاماژە پێکردنە زۆربـەی ئـەو شـاعیرە کوردانـەی کـە بـە شاعیرە فارسەکان کاریگەر بوون و لە سایەی ئەواندا شیعریان هۆنیوەتەوە ، بـە زۆری بە غەزەلە سـەرەتاییەکانی دیوانـە فارسـییەکان کاریگـەر بـوون ،لەوانەیـە هۆیەکەی بە گشتی ئەوەبێ کە ئەو شـاعیرانە نـەیان توانیـوە هـەموو دیوانـەکان بخـوێنن و بـە چـەند غـەزەلێکی سـەرەتای دیوانـەکان کیفایـەتیان کـردووە و لێکچوونەکەش لەم تەوەرەدا خولاوەتەوە .

بەم پێیە مەحوی یەکەم غەزەلی حافزی خوێندۆتەوە و کاری تێی کردووە و غەزەلێکی هۆنیوەتەوە کە لەم لایەنانەوە بە غەزەلەکەی حافز دەچێت لە رووی رخسارەوە :

١-مەحوی و حافز بەم نیوە بەیتەی (یەزیدی کوڕی موعاویە) دەستیان پێکردووە ((الا یا أیها الساقی..........)).

٢-ژمارەی بەیتەکان یەکسانن و هەردووکیان حەفتن.

٣-هەردووکیان لەسەر هەمان کێشی عەرووزی عەرەبین کە بەحری هەزەجی هەشت هەنگاویە .

٤-مەحوی پێنج وشەی سەروای حافزی دووبارە کردۆتەوە کە ئەمانەن :- (مشکلها ، دلها ، منزلها ، محملها ، ساحلها).

بەڵام لە رووی ناوەڕۆکەوە ئەم لێکچوونانە بەر چاو دەکەون:-

١-لە بەیتی یەکەمی مەحوی دووبارە کردنەوەی نیوە بەیتی یەکەمی حافزە :

مەحوی : (الا یا ایها الساقي أدر كأسا و ناولها)

بنور مي تو باز افروز شمع كشتهٔ دلها(١)

حافز : (الا یا ایها الساقي أدر كأسا و ناولها)

كه عشق آسان نمود اول ولي افتاد مشكلها(٢)

نیوە بەیتی دووەمی مەحوی وەکو نیوە بەیتی یەکەمی باسی مەی دەکات کە پەرتەوی ئەو پێکە دەیەوێ مۆمی کوژاوەی دڵەکان داگیر سێنێتەوە.

٢-لای مەحوی بە خەندەیەکی لێوی یار گرێیەکانی دڵ دەکرێنەوە و چارەی هەموو کێشەکان بە ژێر لێوی دولبەرەوەیە ، واتا شتەکە ئاسانە، بەڵام لای حافز سەرەتای عیشق ئاسانە و کۆتاییەکەی گێرمە و کێشەیە .بەم پێیە ئەم بەیتەی خوارەوەی مەحوی لە گەڵ بەشی دووەمی بەیتی یەکەمی حافز پەیوەند دارە:

**مەحوی :** بیا بگشا بیك لب وا نمودن عقدة هاي دل

بیـا اي زیـر لـب خندیـدن تـو حـل

مشكلها(٣)

**حافز :** كه عشق آسان نمود اول ولي افتا د مشكلها(٤)

٣-لەم دوو بەیتەی خوارەوە بەشی دووەمی بەیتەکەی مەحوی لە گەڵ هەمان بەشی بەیتەکەی حافز جۆرە لێکچوونێکیان هەیە کە بریتیە لەوەی ڕێبواری ڕێگەی عیشقی خوایی ئاگاداریی ڕێ و ڕەسمی حاڵ و مەقامەکانی سۆفیگەرییە ،بەڵام لێرەدا زیاتر مەبەستی مەقامەکانە چونکە مەقام لە حاڵ چەسپاوترە و زیاتر هەستی پێ دەکرێت.

**مەحوی :** جگر خون گشتن و از خود گذشتن ،خویش كشتن

ره عشق است ، دارد این مقامات و منازلها(٥)

**حافز :** بمی سجاده رنگین كن گرت پیر مغان گوید

كه سالك بیخبر نبود زراه و رسم منزلها(٦)

٤-هەردوو بەیتەکەی بە گشتی واتایان یەك دەگرێتەوە لەوەی کە کاروانی مردنی ڕێبوارانی عیشقی خوایی بەردەوامە و یەك لەدوای یەك بە یەکتر دەگەن و ژیانی جیهان شتێکی کاتییە و مرۆڤ نابێ پشتی تێدا بکاتەوە و بەڵکو دەبێ هەردەم بار کۆڵەی لە ئامادە بووندا بێ بۆ جیهانی ئەو دیو هەستی:

**مەحوی :** بمردن كم نشد بی تابی عشاق چون مجنون

كه خاكش در لباس گرد گرد د گرد محملها(٧)

**حافز :** مرا در منزل جانان چه امن و عیش چون هردم

جرس فریاد میدارد كه بر بندید محملها(٨)

هەروەها مەحوی لە غەزەلێکی تری فارسیدا چاولێکەریی غەزەلێکی حافزی کردۆتەوە بەڵام لە لایەنی رووخسارەوە هێندەی غەزەلی یەکەم بە هی حافز ناچێ ، لایەنە لێکچووەکانیش لە رووی روخسارەوە ئەمانەی خوارەوەن :

١–هەردووکیان لە سەر کێشی عەرووزی عەرەبین و لە بەحری رەمەلی هەشت هەنگاوین کە تەفعیلەکەی :–

(فاعلاتن،فاعلاتن،فاعلاتن،فاعلات)ە.

٢–هەردووکیان دوا سەروایان وشەی (شما)یە ، بەڵام پێش سەروای مەحوی (وی)یەو پێش سەروای حافز(ان)ە.

٣–هەرچەندە ژمارەی بەیتەکان یەکسان نین،بەڵام نزیکایەتیان هەیە و هی حافز (١٣) بەیتە و هی مەحوی (١١) بەیتە.

لە رووی ناوەرۆکەوەش ئەم هاوبەشیانە دەکەونە بەرچاو :–

أ– هەردوو غەزەلەکە لەبارەی دڵداریی مەجازیین، بەڵام غەزەلەکەی مەحوی زیاتر ئەم سنووورە دەبەزێنێ و جۆرە توانەوەیەك لە یاردا دروست دەکات .

ب–لەم دوو بەیتەدا بەشی یەکەمی هەردووکیان خاوەنی یەك واتان بە گشتی و لە رادەبەدەر رووی یاریان لا جوانە، بۆیە مەحوی وا تێدەگا کە بێگەردیی دڵەکان لەو جوانیەوەیە، کەچی لای حافز جوانی مانگ لەو روخسارە وەرگیراوە.بەڵام بەشی دووەمی بەیتەکان لە یەکتری جیان:–

<u>مەحوی</u> : اي صفاي نور دلها پرتوى روي شما

جان مادر پيچ و تاب از پيچش موي شما(٩)

<u>حافز</u> : اي فروغ حسن ماه از روي رخشان شما

آبروي خوبي از چاه زنخدان شمـــا(١٠)

ج–ئەم دوو نیوە بەیتەی باسی پەرێشانی و ئالۆزکاویی قژی یار دەکەن،لە لای مەحوی گیانی گیرۆدەی ئەو قژەیە ،بەلاّم لای حافز بیر و هۆشی پەرێشانی وەکو زولفی پەرێشانی یارەکەیەتی:–

**مەحوی** : جان مادر پیچ و تاب از پیچش موی شما(١١)

**حافز :** خاطر مجموع ما زلف پریشـان شمـا(١٢)

د– لەم دوو بەیتەدا باسی ستەم و بێ رەحمیی یار دەکەن گەلێ لە دلّداران گیرۆ دەیان بوونە و لەو پێناوەدا کوژراون و خوێنیان رژاوە:

**مەحوی** : زندە مردە ، مردە زندە ، ساختن بایك نگە

در بغل بس سحر دار د چشم جادوی شما(١٣)

**حافز :** دور دار از خاك و خون دامن چو برما بگذري

كاندرين رە كشتە بسيارند قربان شما(١٤)

ه–هەردوو بەیتەکە باسی ئەو بۆنە خۆشە دەکەن کە لە لایەن یارەوە بەر لووتیان دەکەوێ ، جا لای مەحوی ئەو بۆنە سەر بە رێحانی بەهەشت شۆڕ دەکا ،بەلاّم لای حافز ئەو شوێنەی یار پێی لێ دەنێ بۆنی گوڵی لێ دێت:

**مەحوی** : كي مشاش سر فرود آرد بريحان بهشت

هركە بويي يابد از خط سمن بوي شما(١)

**حافز :** با صبا همراه بفرست از رخت گلدەستە

بوكە بوئى بشنويم از خاك بستان شما(١٦)

و–هەردوو بەیتەکە باسی سیحراویی چاوی یار دەکەن و ئەوانەی دەیبینن سەر سوڕماو و مەستن:

**مەحوی** :هر طرف تا بنگری حیران خود بینی بچشم

نرگسستانی بود صحرای أهوی شما(١٧)

حافز :کس بدوری نرگست طرفی نبست از عافیت

به که نفر و شند مستوری به مستان شما(٦)

دوای ئەوەی چەند بەیتێکمان لە دوو غەزەلی مەحوی و حافز بەراورد کرد، ئێستاش بە دوو بەیتی ترتان ئاشنا دەکەین :

هەردوو بەیتەکە ئەوە نیشان دەدەن کە مەحوی و حافز خۆشی و ناخۆشیی یاریان لا یەکسانە ، بۆیە بانگ بکرێن و دەربکرێن ئاساییە لایان:

مەحوی : گر برانی عدل باشد ، ور بخوانی محض فضل

رانده و خوانده بهر حالیم ممنون شما(١٩)

حافز : اگر بلطف بخوانی مزید الطاف است

وگر بقهر برانی درون ما صاف است(٢٠)

وشە لێکچووەکانیش ئەمانەن:(برانی ، بخوانی ، لطف).

لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا جۆرە لێکچوونێك لە رووی ناوەرۆکەوە سەر هەڵدەدا کە بریتیە لەوەی مرۆڤ نابێ پشتی بە جیهانی بێ وەفا ببەستێ چونکە جیهان وەکو سۆزانییە و هەرشەوێ لە باوەشی یەکێکە.بەڵام لە رووی رووخسارەوە ئەم وشە هاوبەشانە بەرچاو دەکەون:(ثبات ،دهر ، یار ، داماد):

مەحوی : ثبات از دهرکم جو چون وفا از رو سپی (محوی)

شده شب یار تو ، فردا بدیگر خانه مادامه(٢١)

حافز : مجو درستی عهد از جهان سست نهاد

که این عجوزه عروس هزار داما داست(٢٢)

## (( بەشی دووەم ))

# لە نێوان شیعرە فارسی و کوردییەکانی مەحوی

دوای هەندێ شارەزا بوون لە شیعرە کوردییەکانی مەحوی و زانینی ئەو سەرچاوە رۆشنبیرییەی کە مەحوی بەرهەمەکانی پێی دەوڵەمەند کردووە ، کەوتمە خولیای ئەوەی کە لە شیعرە فارسییەکانی بگەم و بزانم لە چ ئاستێکی هونەری دانە . لێرەدا ئەو مافە بە خۆم نادەم کە پەیم بە هەموو کەلێنە شاراوەکانی بردووە ، بەڵام هەر هێندە دەڵێم توانیومە بگەمە ئەوەی کە مەحوی لە شیعرە فارسییەکانی گەلێ لایەنی رووخسار و ناوەرۆکی شیعرە کوردییەکانی دووبارە کردۆتەوە و شیعرە فارسییە خواییەکانی لە ئاستی شیعرە کوردییە خواییەکانی نین.نابێ ئەوەش لە یاد بکەین کە مەحوی یەکێکە لەو کەڵە شاعیرە کوردانەی کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن لە هۆنینەوەی شیعری فارسیدا.(١)

لەم بەراوردەدا توانیومانە چەند سەرە بابەتێ دەستنیشان بکەین و هەر کۆمەڵە بەیتێ لە ژێر ناونیشانێ نیشان بدەین و تاکە بەیتەکان بە تەنیا نیشان دراون و لە گەڵ کوردییەکان جووت کراون و لە رووی روخسار و ناوەرۆکەوە ئاماژە بۆ لایەنە لێکچووەکان کراوە . وا لە خوارەوە بە پێی سەرە بابەتەکان بەیتەکان یەك لە دوای یەك تۆمار دەکرێن.

## مەحوی و سووتانی پەروانە

دوور نییە مەحوی مەسەلەی سووتانی پەروانەی لە سەعدی شیرازی وەرگرتبێ چونکە بە شیعرەکانی کاریگەر بووە و لە کۆمەڵێ لە بەیتە فارسی و کوردییەکانی دووبارەی کردۆتەوە ، لەم بارەیەوە سەعدی شیرازی دەڵێت:

زپر وانه بیاموز

کان سوخته راجان شدو آواز نیامد(٢)

و                    بسی و کوردییەکانی بەراورد دەکەین بۆ ئـەوەی بـزانین

تا چ ر               ری لە تەوەری شیعرە کوردییەکانی دەخولێتەوە .

فارسي: سوختن آموزي از پروانه پس عاشق شدن

یا دگیر اول ز دانایی فن آداب داب(٣)

کوردی : پەروانەیەك بە بولبولی واوت کە (بو الفضول)

سووتانە ئیشی ئەهلی مەحەببەت نەهووله هوول(٤)

هەردوو بەیتەکە لە واتای گشتی دەگەنەوە یەك و ئەوە دەگەیەنن کـە عیـشقی راستەقینە ئەوەیە وەکو سووتانی پەروانە بە نهێنی بێ و گریانی تێکەڵ نەبێت . لە لایەنی رووخسارەوەش ئەم وشانە هاوبەشن (سووتان ، پەروانە ، عاشق).

فارسي: علم عشق از حضرت پروانه (محوی) یادگیر

بر مدار اصلا مگر از سفره آزاد زاد(٥)

از بلبل و پروانه بیا عشق بیاموز

بر تر بود این علم ز تعلیم و تعلّم(٦)

کوردی : زوبانی حاڵی پەروانە لە وەختی سووتنا دەیوت

کەسێ واریثمە وەك من بێ لە عیشقا خۆ بسووتێنێ(٧)

لە ئەحبابی قەدیمی بەزمی ئولفەت ماوەتن دوو تەن

یەکێ پەروانە هەم دەردە، یەکێ بولبول کە هەم فەردە(٨)

دیارە خۆ پەروانە هەر سووتانە ئەصلی مودەعای

بۆیە ئێمەش عاشقین ئەی شەخصی ئاتەش خوو بە خووت(٩)

ناوەڕۆکی ئەم پێنج بەیتەی سەرەوە بە گشتی لە چوار چێوەی سووتانی
وانە دێن و دەچن ، سەرەڕای مەسەلەی لێکچواندنی سووتانی عاشقان بە
ی پەروانە ئەوەش دێتە پێشەوە کە عاشقان زانستی عیشق لە پەروانە
و دەبنە میراتگری پەروانە لەو سووتانە ، چونکە ئەو زانستە
ـ خواییە و بە فێر بوون و خوێندن چنگ ناکەوێت ((وعلّمناه من لدنا
ـما)) (١٠) واتا :لە لایەن خۆمانەوە ئەو زانستەمان فێر کرد ، بۆیە پەروانە
هاوڕێی هەمیشەییی عاشقانە و سەرەڕای ئەمەش ئوستادیانە. بەڵام لە رووی
رووخسارەوە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەم وشە هاوبەشانەبکەین (بولبول ، پەروانە ،
عیشق) .

<u>فارسی:</u> (محویا) پروانە پیر کاملی است

سوختن هر سالکی را دین بود(١١)

<u>کوردی :</u> سەکینەی مەرتەبەی سووتانییە ئاتەش پەرستی عیشق

ئەگەر صاحێب ئیرادەت بی عەجەب پیرێکە پەروانە(١٢)

لەم دوو بەیتەی سەرەوەدا جگە لە سووتانی عاشق و پەروانە و لێکچوونیان مەسەلەی پیر دێتە ئاراوە . لێرەدا شاعیر پەروانەی بە (پیر) داناوە و دەبێ عاشق گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکا و لە سووتاندا چاو لەو بکات ، چونکە ڕێبواری سۆفیگەری هەمیشە دەبێ فەرمانەکانی ڕابەری تەریقەت جێ بە جێ بکا و بیکاتە پێشڕەوی خۆی لە هەموو هەڵس و کەوتێکدا. لەم بارەیەوە هەندێ لە کەڵە سۆفیەکان گوتوویانە کە دەبێ ڕێبوار وەکو مردوو بێ لە بەر دەستی مردوو شۆر ((.....حتی یصیر کالمیت بین یدي الغاسل یقلّبه کیف یشاء)) (١٣)،ئەمە لە لایەنی واتاوە ، بەڵام لە لایەنی رووخسارەوە هەمیسان ئەم وشانە دووبارە دەبنەوە (پەروانە ، پیر ، سووتان).

بەم جۆرە بینیمان کە مەحوی لەم وێنەدا هونەرییەدا (سووتانی پەروانە) چاوی لە شاعیرانی پێش خۆی کردووە و بە هەردوو زمانی کوردی و فارسی شیعرەکانی خۆی پێ رەنگین کردووە و بە پیرێکی کامڵی لە قەڵەم داوە.

## ( دەردی عیشق و داغی سینە )

مەحوی وەکو هەموو ئەو شاعیرانەی کە لە عیشقەکەیاندا رۆچوونەتە خوارەوە، دەرد و ئازاری یاریان لا ئاسایی بووە و شانازییان بەو داغانە کردووە کە پێیانەوە نراوە. بۆیە لەو کۆمەڵە بەیتانەی خوارەوەدا دەبینین کە مەحوی بە گڕوتینی ئەوینەکەی داغکراوە و بۆی بوونەتە گەواهیدەری راستیی ئەو خۆشەویستیە.

لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا باسی دەردی عیشق و داغی دڵ دەکا و پێمان رادەگەیەنێ کە ئەم هەموو ئازارە جێی شانازیی عاشقن و بەڵگەی راستیی عیشقن . ئەمە لە رووی واتاوە ، بەڵام لە رووی رووخسارەوە ئەم چەند وشەیە دووبارە بوونەتەوە (داغ ، عیشق ، دڵ ، فەخر) :

<u>فارسی:</u> بچشم کم تو (محوی) ننگر آثار درد عیشق

نشان فخر بشمر داغهای سینه خودرا(١٤)

<u>کوردی :</u> هەر دڵێ پێوە نەبێ داغ و خەطی جێ دەمی تیغ

دەعویی عیشقی ببێ ، دەعوییە بێ مۆر و سەنەد(١٥)

هەروەها لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا مەحوی شانازی بە داغی دڵی دەکا و بۆ یارەکەی روون دەکاتەوە کە جگە لە داغی ئەو جێ خاڵێکی تر لە سینگی حەرامە و پێشی شوورەییە داوای دەرمان بکات :

فارسی: در مذهب ماگر همه انوار علوم است

یك نقطة بجز داغ تو در سینه حرام است(١٦)

کوردی : هەموو فەخری کە داغ و دەردە عاشق

مەبەن، ریسواییە ، ناوی دەوا قەط(١٧)

لەم بەیتە فارسی و سێ بەیتە کوردییەی خوارەوەدا لە رووی ناوەڕۆکەوە یەك دەگرنەوە و جگە لەوەی کە مەحوی بە دەرد و بەڵا و ئازاری یارەکەی قایلە،خۆشی و ناخۆشیی لا یەکسان بووە و دوعا بۆ دەست و تیغی دەکا و لە بەیتی سێیەمی کوردییەکەیدا (خوێناوی جەرگ و نالەیی دڵ)ی بۆ بووەتە دیاری و لە خۆشی و رابواردن و پێك هەڵدان و مۆسیقای لا خۆشترە ،واتا : مەحوی لەوەش رەتبووە کە خۆشی و ناخۆشیی لا وەکو یەك بێت:

فارسی: جفایش راصفا دانم ، بلایش مرهم جانم

ز محبوب دل و جان ، انچه مي آید بود محبوب(١٨)

کوردی : دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ

وەگەرنا ، غەم نییە بمرم لە حەسرەت لێو ی مەیگوونت(١٩)

رەقیبی سەگ حەزی بوو ، کوشتمت ، سەیریکە چۆنی بووم

دوعا بۆ دەست و تێغت من دەکەم ، بڕوانە چۆنم بۆت(٢٠)

خوێناوی جەرگ و نالەیی دڵ گەر عەطا کرا

نۆشینی مەی ، سەماعی نەیە و ، زیر و بەم حەرام(٢١)

لە رووی رووخسارەوەش هەردوو وشەی (جەفا ، صەفا) لە بەیتەکاندا دووبارە بۆتەوە بەڵام نەك بە هەمان شێوە بەڵکو بە واتای خۆشی و ناخۆشی.

مەحوی لەم دوو بەیتەشدا ئەوە روون دەکاتەوە کە هەمیشە حەزی لەوەیە بریني یاری پێوە بێ و بێ یار خۆشیی لە خۆی حەرامکردووە :

**فارسی:** یارب تو مرا باتن پر زخم بمیران

برژنده ببر ، خرقه بی پینه حرام است(۲۲)

**کوردی:** نالّەم لە سینە ، هەم لە دلّم دەرد و غەم حەرام

بێ ، بێ تۆ بەزمی عوشرەت و عەیش ئەر نەکەم حەرام(۲۳)

لەم دوو بەیتە فارسییە و بەیتە کوردییەدا وشەی هاوبەش لە نێوانیاندا تەنیا وشەی (بیسمیل و مەحوی)یە ، بەلاّم لە لایەنی واتاوە لە هەرسێ بەیتەکەدا شاعیر گلەیی لە یارەکەی دەکا و حەزی لێیە تیغی نازی ناوی خوای لێ بێنێ و بیکوژێ . هەروەها ئێرەیی بە وانە دەبات کە بە بەر بیسمیلی یار کەوتوونە و ئاسوودەیی لەوەدایە کە نوێنەکەی بە خوێنی لەشی رەنگین بێت:

**فارسی:** کجا اسوده یا بم جا بروی بستر رنگین

مگر بر بسمل من تیغ نازش سایه گستر باد(۲٤)

توای قاتل کرم کن نیم بسمل ساز(محوی) را

میان سر کشانش شایدش خوانند گردن کچ(۲٥)

**کوردی:** هەموو بیسمیلیە هەر من نیمە بیسمیل

نەبوو کارێ بکا هەر بۆ خودا ، قەط(۲٦)

وشەی هاوبەش لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا (کێو ، کێو هەلّکەن)ە،لە رووی واتاوە هەردوو بەیتەکە لە چوار چێوەی عیشقێکی پاك دەگەڕێن و پێشڕەوی ئەو عسشقەش دوو عاشقی خۆ بەختکەر و بیابان و کەژ و کێو گەڕن کە مەجنوون و فەرهادە. عیشقەکەی مەحویش هەمان عیشقی ئەمانەیە و چاو لە وان دەکا هەرچەندە بە هێز و توانای لەش بە قەد ئەوان نابێت.

نابێ ئەوە لە یاد بکرێ کە عیشقی مەجنوون و فەرهاد لە دوا دواییدا بەرەو عیشقە خواییەکە چوو ، بە تایبەتی مەجنوون بە سێ قۆناغدا رەتبوو:

١–دڵداریی هەستی .

٢–توانەوە لە ناو دولبەردا (لەیلا)، چونکە لێیان دەپرسی ناوت چیە ؟ دەیگوت : لەیلا(٢٧).

٣–گواستنەوە بەرەو خۆشەویستیی خوایی ، چونکە جوانیی لەیلا لە خودی خودادا دەبینی . لەم بارەیەوە (ابن عربي) دەڵێ:((جاءت ليلى الى قيس وهو يصيح ليلى ليلى و يأخذ الجليد و يلقيه على فؤاده فتذيبه حرارة الفؤاد ، فسلّمت عليه وهو في تلك الحال فقالت له : انا مطلوبك ، انا بغيتك ، انا محبوبك ، انا قرّة عينك ، انا ليلى ، فالتفت اليها و قال: دعك عني فإنّ حبّك شغلني عنك)) (٢٨).

بەم جۆرە قەیس دڵداریی هەستیی فەرامۆش کردووە و ئەوینی لەیلای لە خودادا بەرجەستە کردووە.

**فارسي:** بيابان هلاك وكوه غم دارد راه عشق

که دروی چندها مجنون و صدها کو هکن گم شد(٢٩)

**کوردی:** بێستوونی عیشقی شیرینێك ئەوا هاتۆتە پێش

گەر لە حەق بێم و نەیەم ، تەقلیدی فەرهادێ دەکەم(٣٠)

ئەم دوو بەیتەی خوارەوە لە رووی رووخسار لەم وشانە لێك دەچن (زولف ، زنجیر ، نەخچیر ، خەلاص) ، هەردوو بەیتەکان لە واتا گشتیەکەدا هاوبەشن و مەحوی نایەوێ لە زنجیری زولفی یار رزگاری بێت و حەز دەکا هەر لەو داوە بێت و بچێ چونکە هەر هیچ نەبێ لێی نزیك دەبێ و جار و بار بە خەیاڵی یاردا دێت:

**فارسي:** دلْ ز دام زلف دلگیرت نمی خواهد خلاص

شیر ما از قید زنجیرت نمی خواهد خلاص(٣١)

**کوردی:** خەلاصی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زولفی زنجیرت

لەبەر تیرت ، مەلەك بێ ، هەڵفرینی نەبووە نەخچیرت(٣٢)

وشەی لێکچوو لەم سێ بەیتەدا (خاك ، دامێن ، ڕێ)یە ، بەیتەکان لە یەك تەوەرە دەخولێنەوە و شاعیر سەری لە بەر پێی یار داناوە و گەردی گەیشتۆتە دامێنی یار ، ئەمەش پلەیەکی بەرزە کە بە عاشق بەخشراوە و گەیشتووەتێ :

فارسي: در هوای ان بت وحشی براه انتظار

خاك گشتم باز از دامن نمی یابم سراغ(٣٣)

کوردي: پێی بە سەر مانا کە بوومە خاکی ڕێی ، گەردم شوکر

گەبیە داوێنی ، دەلا لێی بای شەماڵم بۆ چیە ؟(٣٤)

مەبزوە (مەحویا) لەم ڕێگەدا تا دەبیە خاکی ڕێ

ئومێدە دەستی گەردت هەر دەگا ئاخر بە داوێنی(٣٥)

هەروەها لەم دوو بەیتەش وشەی لێکچوو ئەمانەن (ئاو ، گەلوەها ، تیغ ، تۆ ، من) ، لە ڕووی واتاوەش تیغی یار گەرووی هەزاران عاشقی تێر خوێن کردووە و لە سەری داون و بۆیان بووەتە ئاوی ژیان ، چونکە مردوون و بەرەو ژیانی هەتا هەتایی چوونە و کەوتوونەتە ژێر سایەی بەزەیی خواوە:

فارسي: آب حیات بخش گلوها است تیغ تو

من هم بسوي رحمت بسیارت آمدم(٣٦)

کوردي: تێر ئاوی کردووە دەمی تێغت چ گەلوەها

تینوو لەو ئاوە مامەوە من هەروەها خصووص(٣٧)

# مەنسووری هەللاج

هەللاج وەکو رەمزێکی هەقپەرستی و شکۆمەندی لە عیشقی خواییدا نۆزدە جار لە دیوانی مەحوی ئاماژەی بۆ کراوە، سێزدە جار لە بەشە کوردییەکەی و شەش جاران لە بەشە فارسییەکەی ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مەحوی رێبازەکەی هەللاجی بە ڕاست زانیوە و بۆی بووەتە سەرچاوەیەکی بیر و باوەڕی شیعرەکانی .

لەم دوو بەیتەدا وشەی هاوبەش لە نێوانیاندا ئەمانەن (هەق بێژی ، دەمگرتن ، مەنسوور) ، لە رووی واتاشەوە لە هەردوو بەیتەکە دەگەینە ئەو راستییە کە هەللاج بەهۆی گوتەی (انا الحق)ەوە تووشی نارەحەتی بووە ، بۆیە دەمگرتن رەحەتییە بۆ شاعیر:

**فارسی:** دهن ببند ، بلا جویی است حق گویی

بدار دست منصوریت ، بدار مپیچ(٣٩)

**کوردی:** حەق بێژییەك گوناهیە مەنصوور و حەقمە من

ئەم قتطعە گەر نیشانی نەدەم ، (مەحویا) بە کەس(٣٩)

لەم دوو بەیتەدا ئەم وشانە لێکچوون (مەنسوور ، بنی زیندان ، سەری دار) ، لە لایەنی ناوەڕۆکەوە هەللاج لە سێدارە دراوە و بووەتە پاشای عیشق ، بەڵام بنی زیندان لە بەیتە فارسییەکەدا شوێنی مەنسوورە و لە کوردییەکەدا شوێنی یونس پێغەمبەر یا زوننوونی میسرییە:

**فارسی:** شە عشقش بیرون آورد منصور از بن زندان

برو بردار گفتش عالم سیر و صفا بنگر(٤٠)

**کوردی:** قاتی پیاوە لە سەر ئەم ئەرزە ، دەبینی مەنصوور

بە سەری دارەوە (ذالنون) لە بنی زیندانا(٤١)

ئەم دوو بەیتەی خوارەوە لە رووی ناوەرۆکەوە بە گشتی دەگەنەوە یەکتر ، مەحوی دەیەوێ چاو لە مەنسوور بکا و بە هۆی ئازاری لەشیەوە بگاتە ژیانی هەتا هەتایی ، چونکە ئەوەی حەق بلێ لە سەری دەدرێ وەکو مەنسووری هەللاج:

**فارسی:** باین جسم نزار و نالهای زار مارا بخش

بگفتا چون سوی دار البقا شد حضرت منصور(٤٢)

**کوردی:** موحەققەق هەرکەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققیە مەنظور

سلووکی چوونە سەر دارە ، طەریقەی پیریە مەنصور(٤٣)

هەروەها ئەم دوو بەیتەش لەم خاڵەدا دەگەنەوە یەکتر کە ئەوانەی بە شوێنی راستیدا دەگەڕێن ئەنجامیان کوژرانە ، هەللاج لەو پێناوەدا چووەتە سەردار و (مەحوی)یش دەیەوێ چاو لەو بکات :

**فارسی:** (محوی) هوای سیر حقیقت بسر چو داشت

منصور وار من بسر دارت آمدم(٤٤)

**کوردی:** دەبینم ئەهلی دڵ یا سەنگە سارە ، یا لەسەر دارە

دیاری عیشق ئەگەر ساغت دەوێ ، هەر دارە ، هەر بەردە(٤٥)

ئەم دوو بەیتەی خوارەوەش هەر هەمان ئەنجامی دوو بەیتەکەی سەرەوەمان نیشان دەدەن:

**فارسی:** منصور یکی خندەو مردانە ز دو رفت

میگفت نیم زن ، بسر دار بگریم(٤٦)

**کوردی:** خۆشی فەرموو چ مەجنوون و چ مەنصوور

بەشی عاشق درا هەر بەرد و ، هەر دار(٤٧)

# هیوا خواستنی مردن

لە کۆمەڵە بەیتێکدا مەحوی بێزاریی خۆی لە ژیان دەردەبڕێ چونکە ژین پەردەیەکە لە نێوان بەندە و خوادا، هەرکە ئەو پەردەیە لاچوو دەگاتە خزمەتی بارەگای یەزدانی و پێ لە مەقامی گەیشتن (وصول) دەنێ، بۆیە مەحوی دەبینین لە چەند شوێنێکدا هیوای مردن دەخوازێ یاخود ئاواتە خوازی ئەوەیە بە دەستی یار بکوژرێ و تیغی بێتە سەر ملی . ئەمەش پیشەی هەموو عاشقانی خوایە و دەیانەوێ پێش ئەجەلی خۆیان بمرن و لە خەو بێدار بنەوە ((الناس نیام فإذا ماتوا انتبهوا)) (٤٨).

لەم کۆمەڵە بەیتەفارسی و کوردییەی مەحوی دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە یار زۆر جاران بەڵێنی بە مەحوی داوە کە لە ژیانی بێهوودەی جیهان رزگاری بکات و گیانی لێ بسێنێت ، بەڵام مەحوی هەر چاوەڕوانی جێ بە جێکردنی ئەو بەڵێنەیە و هێشتا نەکەوتۆتە بەر تیغی برۆ و تیژی برژانگی .نابێت ئەوە لە یاد بکرێ کە عاشق لەوانەش (مەحوی) هەندێ جار لەبەر دوورکەوتنەوە لە یارەکەی ژیانی تەنیایی لا قورس دەبێ و مردن و کوژرانی پێ چاکتر دەبێ. خۆشیەکە لەوەدایە مەحوی لە بەیتێکدا سوپاسی خوا دەکا کە یارەکەی ناوی ئەویشی خستۆتە لیستی کوژراوانی خۆی و بە بیری هاتۆتەوە.

فارسی: وعد فردا کشتن اي قاتل ز فردا ها گذشت

انتظار کشتنم کشت ، آخر این فردا بیا(٤٩)

کشته گشته سوخته بهتر زبی تو زیستن

سوختن یا کشتنم را امر فرما یابیا(٥٠)

کوردی: شوکر مەحوی کەوا مژدێکە ناوی چوو بووە نیسیان

لە زومرەی وەعدی کوشتن هاتوو وا ناهاتەوە بیرت(٥١)

چاوی لە وەعدی کوشتنی من چاوی دزیەوە

خوونکاری وا ، دەبێ لە قسەی خۆی نەکا نکووڵ(٥٢)

بۆ شوکری جەوری ئەو دوو برۆیە لە قەتڵما

هەر بن موێکە میثلي گوڵی شەست پەڕ زوبان(٥٣)

ئاوی تێغی هەر زامێ بوو ئاوا

برینی من نەبێ هەروایە وە یران(٥٤)

بە خۆ کوشتن نەجاتی خۆ بدە (مەحوی) وەکو فەرهاد

لە زۆری قەهرەمانی عیشق ، ئەفەندەم هەر ئەجەل بەستە(٥٥)

شەو بە قەتلم وەعدی دا ، ئەمڕۆ پەشیمانە خودا

خۆ لە (مەحوی) جونحە هەر گەردەن کە چی بوو سەر زەدە(٥٦)

چاوی بیماری بە وەعدی تیرە بارانی نیگاه

گفتی دا ، جەهدێ کە ئەی دڵ ، بەڵکی تۆشی بەرکەوی(٥٧)

ئەم دوو بەیتەی خوارەوە لەوە دەگەنەوە یەك کە ڕێگای عیشق پڕ مەترسییە و چەندەها قۆناغی قورسی تێدایە و ڕێبوار لەو ڕێگایەدا زۆر جاران دەمرێ ،دەکوژرێ ، نیوە مر دەبێ ، وشەی هاوبەش ئەمانەن (ڕێگای عیشق ، کوشتن):

فارسی: جگر خون گشتن و از خود گذشتن و خویشتن کشتن

ره عشق است دارد این مقامات و منازلها(٥٨)

کوردی: دڵ چووە وادی مەحەببەت هەرچی دی هەر کوشتە ، یا

نیوە کوژراوە ، لە سەر لێو ئاه و ناڵەی وا ئەسەف(٥٩)

هەروەها ئەم سێ بەیتەش بە گشتی لە چوار چێوەی کوشتنی عاشق دێن و دەچن و (مەحوی) بە هیوای ئەوەیە کە یار پەشیمان نەبێتەوە و بە دەستی پیرۆزی بیکوژێت و وشەی (نا) نەبیستێ:

فارسي:حرف رد از بارگاه کشتنم نشنید کس

گربیایی و رنیایی ، اوست گوید هابیا(٦٠)

کوردی: لە ناوا باسی تۆبەی تۆ بوو ئەی ستەمگەر شۆخ

بخە ئەم تۆ بە پاشی کوشتنی من ، تۆ بیوو پیرت(٦١)

شەرتی کرد ئیتر لە کوشتن بەس بکا ،یارەب بکەی

ئەو وەفا بەم شەرطە کا ، ئەمما لە قەتلی من بە پاش(٦٢)

جیاوازیی ئەم دوو بەیتەی خوارەوە لەوەی سەرەوە لەوەدایە کە (مەحوی) گیانی لە ناو لەپی دەستی داناوە و چاوەڕوانی فەرمانی یارە و خوا خوایەتی لە سەری بدا و بیگەیەنێتە پایەی شەهید بوون :

فارسي: شهادت انتظارانیم (محوي) جمله جان برکف

براهش ایستاده تادم تیغش چه فرمايد(٦٣)

کوردی: ئاوی تێغی وەقفی هەر تۆشنە لە بێکە ، من نەبێ

کارگەر بێ ، بانەبێ ، لەم مەظلەمەدا دێ دەکەم(٦٤)

لەم دوو بەیتەدا مەحوی جیهانی لا تەنگ بووە چونکە یار لە کوشتنی پەشیمان بۆتەوە و حەز دەکا هەر نالەی ببیستێ و جارێ رزگاری نەکا و نەیگەیەنێتە مەبەستی خۆی:

فارسي: ز قتلم باز گشت ، از ناله ام گفت

بماند خوشتر این مرغ خوش آهنگ(٦٥)

**کوردی:** کوشتەی ئەو چاوەم لە جەمعی کوشتەگان

خەنجەری موژگانی من(منها) دەکا(٦٦)

ئەمجارە هەڵوێستی یار گۆڕاوە و بە پێی ویستی مەحوی برۆی لە کارە،لە بەیتە فارسییەکەدا وا دیارە یار ئامادەی لەسەر دانی مەحوییە بۆیە دەڵێ :سەر شۆڕ بم ئەگەر جگە لە سایەی تیغی تۆ پەنا بۆ هیچ شتێکی تر ببەم ، لە کوردییەکەشدا برۆی یار بە کارە هەرچی بەر کەوتووە لە سەری داوە و رزگاری کردووە :

**فارسی:** سر افگنده باشم گر از بیم سر

بجز سایه تیغت آرم پناه(٦٧)

**کوردی:** برۆی ئەو شۆخە ئەمڕۆ تێغی کێشا

نەجاتی دا بە رەحمەت هەرچی بەرکەوت(٦٨)

## مەجنوون و کۆهکەن

مەحوی وەکو زۆربەی شاعیرانی تری رۆژهەڵات سوودی لە فۆلکلۆری ناوچەی ئەو رۆژهەڵاتەی وەرگرتووە و شیعرەکانی خۆی پێ رازاندۆتەوە ، بە تایبەتی چیرۆکی دڵداریی لەیلا و مەجنوون و شیرین و فەرهاد ، ئەم دوو چیرۆکە لە دڵدارییە ئاساییەکە بەرەو دڵدارییەکی خوایی چوونە و بوونەتە هاوشانی رووداوی رابیعەی عەدەوی و ئیبراهیمی ئەدهەم و مەنسووری هەللاج... هتد.هەروەها ئەم چیرۆکانە بوونەتە رەمزی خۆ بەختکردن و دەربەدەری و پەرجوێکی دڵداری و ناویان لە تۆمارگەی عیشقدا هەر بە زیندوێتی دەمێنێتەوە.

مەحوی لەم دوو بەیتە فارسی و کوردییەدا ئەوەمان نیشان دەدا کە ناوی مەجنوون (قیس) لەبەر بەرزیی عیشق هەر بە زیندوێتی دەمێنێتەوە و هەر

چەندە بە شێتیش ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام گەلێ هۆشداری دوورە عیشق ناویان لە بیرکراوە و گەلێکیش لە سایەی مەجنوون ئاسا بە پایەی بەرز گەیشتوون:

فارسی: نام مجنون است زنده تا ابد ز اعجاز عشق

این همه عاقل که بود آمد بدنیا مرد و رفت(٦٩)

کوردی: دەکەن رەشتاڵەیەکی دەشتەکی باسی لە گەڵ شیرین

دەبەن بەرد هەڵکەنێکی کێزری ناوی لە گەڵ مەجنوون(٧٠)

وشەی لێکچوو لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا ئەمانەن(بیابان ، سارا ، مەجنوون ، شار)، لە رووی واتاوە دەگەنەوە یەك و باسی ئەوە دەکەن کە مەجنوون لە بەر گرانیی باری عیشقەکەی بەرەو بیابان دەچێ و جێی لە شار نابێتەوە ، چونکە سروشتی بیابان زیاتر لە حەقیقەت نزیکە و عاشق بە دولبەر دەگەیەنێ:

فارسی: رم میکند از خلق چو آن آهوی وحشی

مجنون من از شهر بصحرا شده قانع(٧١)

کوردی: بە جێ نایێ دەبێ رووکەینە سارا

حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا(٧٢)

لەم دوو بەیتەی خوارەوەدا کۆمەڵە وشەیێ دووبارە بوونەتەوە (مەجنوون ، فەرهاد ، کێو ، بیابان)،جگە لە واتا گشتییەکەی کە رۆیشتنی مەجنوونە بەرەو بیابان و فەرهادە بەرەو کەژ و کێو:

فارسی: یك ناله ز مجنون و ز فرهاد بیادم

بگذشت ، بهامون و بکهسار بگریم(٧٣)

کوردی: هەرکۆکەن و مەجنوونە کوڕی کێو و بیابان

غەیری کون و قوژبن کە لە فەرزانە حەرامە(٧٤)

# یار و پێك هەڵدان

سەرەتا دەبێ ئەوە روون بکرێتەوە کە ساقی و مەی و مەیخانە و پیاڵەی شەراب و مەستی لای شاعیرێکی سۆفیی وەکو مەحوی هەموو رەمزن و وشەی هاوبەش لەم دوو بەیتەدا (مەینۆشی ، فتوا)یە ، لە رووی واتاوە لە فتوادان بە مەینۆشی بە پێی رێبازی عیشق یەکتر دەگرنەوە،بەیتە کوردییەکەی زۆر بە مێژترە و موفتی و قازی لەبەر نازی یار بە مەستی فتوای حەلاڵ کردنی مەی دەدەن بەلام مەیی نیستی:-

**فارسي**: با یاد لب تست اگر فتوی عشق است

جز با دەکشی درشب آدینە حرام است(۷۹)

**کوردی**: ببینن گەر لە ساقی ناز و عیشوێك ئێمە دەبینین

بە مەینۆشی دەدەن فتوا بە مەستی موفتی و قازی(۸۰)

لەم دوو بەیتەشدا وشەی لێکچوو ئەمانەن (طەرەبناك ،غەضەبناك ، بادە) ،بەلام لە رووی واتاوە بە پێچەوانەوەن .لە فارسییەکەدا مەیگێڕ ئاسوودەیە و مەیەکە دڵ دەگوشێ،بەلام لە کوردییەکەدا مەی دلگرە و مەیگێڕ توند و توورەیە :-.

**فارسي**: طربناك است آن شوخ غضبناك ار بریز دخون

کە غیظ زمي کشیدن رفتە بیرون از دل غایظ(۸۱)

**کوردی**: گوڵاو و ئاگراوە بادە ئەمشەو

طەرەبناکە مەی و ، ساقی غەضەبناك(۸۲)

لەم بەیتە فارسی و دوو بەیتە کوردییەدا ئەم وشە لێکچووانە بەر چاو دەکەون (زاهید ، طاعەت ، مەی ،تاك) ، لە رووی واتاوە بۆ ئەوە دەچن کە زاهید خوا

پەرستییەکەی بۆ ریایە و نۆشینی مەی لە داری مێوە (تاك) نەك لە داری (ئەراك) کە ئالیکی حوشترە:

**فارسي:** زاهد ز طاعت است غرورش ،مرا ز مي

او باده کش ز چوب أراکست ، ماز تاك(۸۳)

**کوردی:** بەو طاعەتە کە بۆ ئەم و ئەویە ،بەهەشتی ویست

زاهید ئومێدەوارە بە ئەجری ریا ، ریاض(۸٤)

تاکی رواوی خاکی چ مەینەت زەدە بووە

پشکووتەوە لە بەزمی مەی ،ئەمشەو هەر ئینقیباض(۸۵)

## بە هیچ نەزانینی جیهان

بێگومان نیشانەی مرۆڤی خواناس ئەوەیە کە ژیانی جیهان بە هەند نەزانێ چونکە بڕانەوەی لە دوایە و ژیانێکی کاتییە و بەرەو ژینی جیهانی هەتا هەتایی هەنگاو دەنێت. مەحویش کە یەکێکە لەو خواناسانەبێزاریی لە جیهان دەربڕیوە و بە هیچی داناوە. لەم دوو بەیتە فارسی و کوردییەی مەحویدا و وشەی هاوبەشەکان ئەمانەن (دنیا ، هیچ ، ئەو ، هەموو) ، واتاکەشیان بە گشتی لەبارەی بێ نرخیی جیهانە و واز نەهێنانە لێی:

**فارسي:** دنیا همه هیچ است و ولی هیچ ترازوی

ماییم که در باخته ایم این همه با هیچ(۸٦)

**کوردی:** دنیا کە هیچە هەموو دەزانن ، کەچی چ کەس

مەردانە بۆ خودا نییە دەس هەڵگرێ لە هیچ(۸۷)

ئەم دوو بەیتەش هەمان واتای بەیتەکانی پێشوو دەگەیەنن ، جگە لەوەش مەحوی دەبێ یا واز لە یارەکەی بێنێ لە جیهان ویستی ،چونکە یار و جیهان

ویستی بە یەکەوە ناگونجێن. لە رووی رووخساریش ئەم وشانە پێك دەچن (یار ، دنیا ، تەرك ، تۆ):

**فارسی:** همیشه (محویا) ترك تو دارد در نظر دنیا

تو پیش ازوی بیا ، گر پیشبینی ، ترك دنیا كن(٨٨)

**کوردی:** لەسەر تۆم دوشمنە دنیا قەضییەم (مانع الجمع)ە

کە تەرکی تۆ نەکەم ، تەرکی هەموو دنیا نەکەم چیبکەم(٨٩)

لە لایەکی ترەوە ئەم دوانەش سەرەڕای وشە هاوبەشەکان(جیهان ، روو سپی ، مەحوی ، بەردەوامی) واتاکانیشیان یەکە و لە هەدوو بەیتەکە مەحوی ئەوەمان نیشان دەدا کە جیهان وەکو سۆزانی وایە و هەر شەوەی لە باوەشی یەکێکە و وەفای بۆ کەس نییە و داوامان لیّ دەکا کە لیّی دوور کەوینەوە:

**فارسی:** ثبات از دهرکم جو چون وفا از رو سپی (محوی)

شده شب یار تو ، فردا بدیگرخانه مادامه(٩٠)

**کوردی:** دنیا بە حیلە مەیلی بە ئەبنای ئەگەر ببیّ

ئەم (دایەر رێزبار)ە بە فرزەندی شوو دەکا(٩١)

تا لە ماڵی دەرنەکردووی ئەم شەوی صەد شووکەرە

(مەحوی) ئازانە بدە تۆ سیّ بە سیّ دنیا(طەلاق)(٩٢)

# چەند بەیتێکی هەمە جۆر

جگە لەو سەرە بابەتانەی کە دەستنیشانکران، کۆمەڵەبەیتێکی هەمە جۆری تر بەرچاو دەکەون کە لە رووی رووخسار و ناوەڕۆکەوە لێکچوونیان هەیە ، وا لە خوارەوە تۆمار دەکرێن:

لەم دوو بەیتەدا وشە هاوبەشەکان ئەمانەن (کل ، گەردی رێ ، پێ ، بێ رەواجیی کل) ، لە لایەنی واتاوە گەردی ژێر پێی یار بۆ دڵدار بووەتە سورمەی چاو و رەواجی کلی کلفرۆشی نەهێشتووە:

**فارسي:** شدم مستغنی از کحل الجواهر تا ابد(محوی)

که گردی زان کف پایم بچشم انتظار آمد(٩٣)

**کوردی:** دای ئیزنی هەرچی دیدە غەزالە لە گەردی رێی

بێچارە ، کلفرۆشە ، رەواجی کلی شکا(٩٤)

لەم دوو بەیتەی خوارەوەشدا ئەم وشانە لێکچوون(شەرح ، گولشەنی راز) (٩٥)،لە لایەنی واتاوە بەشی دووەمی بەیتە فارسییەکە و بەشی یەکەمی کوردییەکە بریتین لە لێکدانەوەی کتێبی گولشەنی راز لەگەڵ هەندێ جیاوازی لە نێوانیاندا ، چونکە لە فارسییەکەدا رەقیب بە سەلبیەوە لەگەڵ دێو باسی ئەو کتێبە دەکەن:

**فارسي:** از رقیب احوال (محوی) را بپرسید آن پری

میکند با دیو بحث از (گلشن راز) العیاذ(٩٦)

**کوردی:** مەشغوولی شەرحی (گلشن راز)م دەفەرموێ

سینەم کە شەرحە شەرحە دەکاتن بە تیغی ناز(٩٧)

مەحوی لەم دوو بەیتەدا پەیڕەویی عاشقە مەزنەکانی کردووە و ویستوێتی رازی عیشقەکەی نەدرکێنێ ، بەڵام هەروەك چۆن هەللاج خۆی لە بەیتێکدا داوای نەدرکاندنی نهێنی عیشق دەکا(٩٨) و هەرخۆشی درکاندی و تووشی لە سێدارە دان بوو ، مەحویش ویستوێتی نەیدرکێنێ ، بەڵام فرمێسکی خوێنینی لێی لە هەڵلا داوە ، وشە لێکچووەکانیش ئەمانەن (راز ، فاش ، ئەشکی خوێنین) :

**فارسي:** راز مستور شد از سرخی تو فاش ای اشك

ماجراها بر خ زر د من آوردی حیف(٩٩)

**کوردی:** بەس بکە ئەی ئەشکی خوێنینم بە غەممازی تەلاش

رازی عیشق و دەردی دڵ خۆ هەرچی بوو کردووتە فاش(١٠٠)

لەم بەیتە فارسی و سێ بەیتە کوردییەدا وشەی هاوبەش لە نێوانیاندا (جوێن)ە ، بەڵام لە لایەنی واتاوە بە گشتی لەسەر ئەوەن کە عاشق جوێنی یاری لا خۆشترە لە ماچ و قسەی خۆش و بە ستایشی کەسانی تری ناگۆڕێتەوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مەحویی سۆفی خۆی داوەتە دەستی یار و مل کەچی هەموو فەرمانێکیتی :

**فارسي:** دشنام تو هر کو به ثنای دیگران داد

بهر خزف او از درّ یکتا شده قانع(١٠١)

**کوردی:** بە دڵمە جوێنی ئەو لێوە ، لە بۆسە نەشئە بە خشاتر

لە کن تریا کییە ئەلبەتتە قاوە صەد لە چا چاتر(١٠٢)

هجوومی عاشقانی دی کە مشتێ جوێنی پێ بەخشین

بەسەر خوتانییا دابەش بکەن ، سابەش بکا یانە(١٠٣)

رەقیب ئەڵبەتتە ئیمشەو شەق دەبا ، جانانە ئێوارە

بە عوششاقی تەقە بوڵ دا لە ناتی صەد دوعا جوێنێ(١٠٤)

وشە هاوبەشەکانی ئەم دوو بەیتە (رێ، سەر، تاج ، دەرگا)یە ، واتای گشتییان بریتییە لەوەی کە خاکی بەر دەرگانەی خۆشەویست بۆ دڵدار وەکو تاجێکی پاشایانە وایە و شانازیی پێوە دەکات:

**فارسی:** خاك رهش بپاش بسر تاج شاهی است

راهش بسوی کعبه و مقصود شاه راه(١٠٥)

**کوردی:** رێی دا لە قاپییا بمرم ، پێشی سەر سەرم

نا ، وا گەدا دەبێ بە خوداوەندی تەخت و تاج(١٠٦)

(قیامەت ، هەستان) لەم دوو بەیتەدا وشەی لێکچوون ، لە رووی واتاوە لەو خاڵە یەك دەگرنەوە کە لەبەر هەستانی یار ئەو ناوە خرۆشاوە وەکو بڵێی قیامەت هەستا بێ و ئاخر زەمان بێت:

**فارسی:** قیامت را بپا کرد از قیامت قامت رعنا

نهی گامی بره بر پا کنی صد گونه هنگامه(١٠٧)

**کوردی:** بە جێیە چونکە ئەو هەستا ، قیامەت جێ بە جێ هەستا

لە چەرخ ئەمشەو ، وەکو ئەشکم لە دیدە ، داوەرێ کەوکەب(١٠٨)

لەم دوو بەیتەدا وشەکانی (ذەرە ، موور ، لاقە کوللە) هاوبەشن، جگە لەوەش لە هەردووکیاندا خزمەتکردنێ نیشان دراوە، بەڵام شاعیر بە کەمی دەزانێ و لای وایە وکو لاقە کوللەیەك وایە و شایانی بەر پێی یاری نییە:

**فارسی:** نثار خاك راهت را بجز یك ذره جانم نیست

حز این پای ملخ زین مور می ناید ره آوردي(١٠٩)

**کوردی:** یارەب قبوولی کەی لەکەم ، ئەم خدمەتەکەمە

ئەم دەرپە موورە لاقە کولێ زۆرە ئەرمەغان(١١٠)

وشە لێکچووەکان ئەمانەن (کوردی ، فارسی ، زوبان) ، بەیتی یەکەم و دووەم لە رووی واتاوە زۆر لە یەك دەچن و شانازی بە زمانی کوردی دەکەن بەرامبەر فارسی ، هەرچەندە بەیتی دووەمی کوردییەکە ئەوەندی فارسیییەکە لە گەڵی ناگونجێبەڵام هەر شانازیکردنە بە زمانی کوردی بەرامبەر زمانی عەرەبی:

**فارسی:** فخری هرکس بزبان خودش است ای (محوی)

پارسی را تو کە بگزیدە بر کردی حیف(١١١)

**کوردی:** کوردی زوبانی ئەسڵمە گەر تەرکی کەم بە کول

بۆ فارسی ، بە کوللی ئەمن دەبمە بێ وەفا(١١٢)

لە هەمزیە و لە بوردەم چونکە کەم دی ئیستیفادەی کورد

منیش ئەم کوردییەم دانا لە ریزی ئەو قەصیدانە(١١٣)

هەروەها لەم سێ بەیتەشدا ئەم وشانە هاوبەشن (هیچ ، دەم ، نادیار) ، بەگشتی واتای هەرسێ بەیتەکە بریتییە لەوەی کە دەمی یار لەبەر بچووکی نادیارە و عاشق ناتوانێ ماچی بکا ، بەڵام لە بەیتە فارسییەکە ناو قەدی یاریشی هێندە بە باریك داناوە کە وەکو دەمی دیار نییە:

**فارسی:** هیچ است میان و دهن دلبر ما هیچ

بر پاشدە آشوب دو عالم ز دو تا هیچ(١١٤)

**کوردی:** ماچی دەمی لە کەڵکەڵە مابوو ،چ خۆشی وت

قرم ئەی ئەسیری واهیمە ، خۆش ناکرێ لە هیچ(١١٥)

دەم نادیار و نازی قسەی پڕ بە دەشت و شار

دنیایەك ئاوی زیندە گیو و دەرخرێ لە هیچ(١١٦)

# ئەنجام

دوای ئەوەی بە پێی توانا ئەو باسەی کە لەژێر ناونیشانی ((شیعرە فارسییە کانی مەحوی لە نێوان چاولێکەری و دووبارە کردنەوەدا)) ئەنجام درا ، گەیشتینە ئەم خاڵانەی خوارەوە :

١-مەحوی لە شیعرە فارسییەکانیدا بە حافزی شیرازی کاریگەرە و لە شوێنی خۆی بە نموونەوە ئەمە روون کراوەتەوە.

٢-کاریگەرییەکەی بە حافز زیاتر لە لایەنی روخسارەوەیە ، بەڵام شیعرە کوردییەکانی زیاتر لە رووی ناوەرۆکەوە بە حافزی شیرازی کاریگەرن.

٣-شیعرە فارسییەکانی لەم بابەتانەی خوارەوەدا لە رووی رووخسار و ناوەرۆکەوە بە شیعرە کوردییەکانی کاریگەرن(سووتانی پەروانە، دەردی عیشق، رووداوی هەللاج، مردن لە پێناو یار، مەجنوون و فەرهاد، یار و مەی و مەیخانە، بەهیچ نەزانینی جیهان) سەرەڕای کۆمەڵە بەیتێکی تر کە لە بابەتی جیاجیانە.

٤-شیعرە فارسییەکانی زیاتر لە رووی ناوەرۆکەوە بە کوردییەکانی دەچن.

# پەراوێزەکان

-بەشی یەکەم

(١)دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل٤٧٧.

(٢)ديواني حافظ،تيمور برهان ليمودهي، ص١٥.

(٣)دیوانی مەحوی، ل٤٧٧.

(٤) دیوانی حافظ، ص١٥.

(٥) دیوانی مەحوی، ل٤٧٧.

(٦) دیوانی حافظ، ص١٥.

(٧) دیوانی مەحوی، ل٤٧٧.

(٨) دیوانی حافظ، ص١٥.

(٩) دیوانی مەحوی، ل٤٧٦.

(١٠) دیوانی حافظ، ص١٦.

(١١) دیوانی مەحوی، ل٤٧٦.

(١٢) دیوانی حافظ، ص١٦.ئەم بەیتە لە (شرح سۆدی بر حافظ)دا بەرچاو ناکەوێت.

(١٣) دیوانی مەحوی، ل٤٧٧.

(١٤) دیوانی حافظ، ص١٦.

(١٥) دیوانی مەحوی، ل٤٧٦.

(١٦) دیوانی حافظ، ص١٦.

(١٧) دیوانی مەحوی، ل٤٧٦.

(١٨) دیوانی حافظ، ص١٦.

(١٩) دیوانی مەحوی، ل٤٧٥.

(٢٠) دیوانی حافظ، ص٤٤.

(٢١) دیوانی مەحوی، ل٥٧٢.

(٢٢) دیوانی حافظ، ص٢٧.

-بەشی دووەم

(١)بە باوەڕی خۆم (مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەحوی و شێخ ڕەزا و بێخود) چاکترین شاعیری کوردن کە شیعری فارسییان نووسیوە.

(٢)گلستان سعدی ، ص٥.

(٣)دیوانی مەحوی ، ل٤٨٠.

(٤)سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٠٦.

(٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٩٤.

(٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١٨.

(٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣١١.

(٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٠.

(٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٧٨.

(١٠)الكهف/٦٥.

(١١)دیوانی مەحوی ، ل٥٠٠.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٨.

(١٣)البهجة السنية في آداب الطريقة العلية الخالدية النقشبندية ، محمد بن عبدالله الخاني ، ص٢٤/الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية ، محمد بن سليمان البغدادي ، ص٣١.

(١٤)دیوانی مەحوی ، ل٤٧٤.

(١٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل١١٢.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٨٣.

(١٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٦٠.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٨٢.

(١٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٧٤.

(٢٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٧٦.

(٢١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢١٢.

(٢٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٨٣.

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢١٠.

(٢٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٩٣.

(٢٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٨٩.

(٢٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٦٠.

(٢٧) نشأة التصوف الإسلامي ،د.ابراهيم البسيوني ،ص٢١٩.

(٢٨) الفتوحات المكيه ، ج٢ ،ص٣٢٥.

(٢٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٩٦.

(٣٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٣٤.

(٣١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٥.

(٣٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٦.

(٣٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٩.

(٣٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٩٢.

(٣٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣١٢.

(٣٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١٦.

(٣٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥٤.

(٣٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٨٩.

(٣٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٤٩.

(٤٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٢.

(٤١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٤.

(٤٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٤.

(٤٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٢٧.

(٤٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١٧.

(٤٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٢.

(٤٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١٩.

(٤٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٢٠.

(٤٨) احياو علوم الدين ، ج٤ ، ص٣٣.

(٤٩)ديوانی مەحوی، ل٤٧٩.

(٥٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٧٩.

(٥١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٩.

(٥٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٠٦.

(٥٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٤٠.

(٥٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٤١.

(٥٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٦٧.

(٥٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٤.

(٥٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣١٩.

(٥٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٧٧.

(٥٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٧٩.

(٦٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٧٨.

(٦١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٦٧.

(٦٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥٠.

(٦٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٠.

(٦٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٣٤.

(٦٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١٤.

(٦٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٣.

(٦٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢٤.

(٦٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٨٩.

(٦٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٨٥.

(٧٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٥٠.

(٧١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٩.

(٧٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل٧.

(٧٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢٠.

(٧٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٦.

(٧٥)ساقی : ئاوگێڕی کەوسەر و رابەری تەریقەتە، بە فریشتەی مردنیش دەگوترێ . فرهنگ لغات و اصطلاحات و تعبیرات عرفاني ، د.سید جعفر سجادي ،ص٢٥٢.

(٧٦)بە گرگرتنی عیشق و ئارەزووی خۆشیی رێبواری سۆفیگەری دەگوترێ .فرهنگ لغات ، ص٤٥٨.

(٧٧)بریتیە لە دەروونی خواناسی کامڵ کە زانستی خوایی لێوە هەڵدەقوڵێ، هەروەها تەکیە و خانەقاکانی رابەری کاملیش دەگرێتەوە. فرهنگ لغات..،ص٤٥٩-٤٦٠.

(٧٨) پیاڵە :بریتیە لە یار و خۆشەویست، هەموو گەردیلەیەکی بوون وەکو پیاڵە دێتە بەر چاو چونکە سۆفی زانیاریی لێ نۆش دەکا ،پیاڵە بە واتای بێگەردیی دیار و نادیار (الظاهر و الباطن) دێت . فرهنگ لغات.....،ص١١٣.

(٧٩)دیوانی مەحوی ، ل٤٨٣.

(٨٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٠٥.

(٨١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠٨.

(٨٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٨٦.

(٨٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١٣.

(٨٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥٦.

(٨٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥٧.

(٨٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٩٠.

(٨٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٨.

(٨٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢١.

(٨٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٣٢.

(٩٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢٧.

(٩١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٦.

(٩٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٨٠.

(٩٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٩٧.

(٩٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٠.

(٩٥)گوڵشەنی راز :دیوانێکی فارسیی سۆفیانەی شێخ مەحموودی شەبستەرییە ١٢٨٨ز–١٣٢٠ز لەبارەی یەکێتی بوونە . گلشن راز ،ص٤.

(٩٦)دیوانی مەحوی ، ل٥٠١.

(٩٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٤.

(٩٨)لەم بارەیەوە هەللاج دەڵێت:

من لم یصن سرّ مولاه و سیده		لم یأ منوه علی الأسرار ما عاشا

دیوان الحلاج ، ص٤١.

(٩٩)دیوانی مەحوی ، ل٥١١.

(١٠٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥٠.

(١٠١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٩٩.

(١٠٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٢٥.

(١٠٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٧.

(١٠٤) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣١١.

(١٠٥) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢٥.

(١٠٦) سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٢.

(١٠٧) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢٧.

(١٠٨) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٠.

(١٠٩) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥٢٩.

(١١٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٦٨.

(١١١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٥١١.

(١١٢) سەرچاوەی پێشوو ، ل١١.

(١١٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٥٢.

# (( سەرچاوەکان ))

**کوردییەکان**

١–دیوانی مەحوی ،چ٢ ، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی ئۆفێستی حیسام ، بەغدا ١٩٨٤.

**عەرەبییەکان**

٢–القرأن الكريم.

٣–احياء علوم الدين ، الغزالي ،دار المعرفة ، بيروت ١٩٨٢.

٤–البهجة السنية في آداب الطريقة العلية الخالدية النقشبندية ، محمد بن عبدالله الخاني ،وقف الإخلاص ،استانبول– تركيا ،١٩٩٦.

٥–الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية ، محمد بن سليمان البغدادي ،وقف الإخلاص ، استانبول–تركيا ،١٩٩٢.

٦–ديوان الحلاج ، ط٢ ،د.كامل مصطفى الشيبي ،طبع دار آفاق عربية للصحافة و النشر ، بغداد ١٩٨٤.

٧– الفتوحات المكية ، ابن عربي ، دار صادر– بيروت

**فارسییەکان**

٨–ديوان حافظ ، تيمور برهان ليمودهى . انتشارات كاويان.

٩–فرهنگ لغات و اصطلاحات و تعبيرات عرفانى . چ٢ ، سيد جعفر سجادى ، كتابخانه طهورى–تهران ١٢٥٤ هـ.ش .

١٠–گلستان سعدى ، محمد على فروغى . چاپ مهارت

# شیعرە فارسییەکانی مەحوی لە ڕوانگەی سۆفیگەرییەوە

## ( پێشەکی )

مەحوی یەکێکە لەو شاعیرە سۆفییە مەزنانەی کە ڕۆڵێکی گرنگیان لەشیعری سۆفیگەریدا هەبووە لەئەدەبی کوردیدا و شیعرە سۆفیگەریەکوردیەکانی بە لووتکەی شیعرەکانی دادەنرێ و لەکرمانجی خوارووودا هاوشانی نییە.

مەحوی شیعرە سۆفیگەریەکوردییەکانی لەدوو سەرچاوەی ئیسلامی و فەلسەفی هەڵێنجاندووە و لایەنە سۆفیگەریە فەلسەفییەکانی وەکو یەکێتی بوون و یەکێتی ئاینەکان و یەکبوون و راستیی محەمەدی لەتوێی بەیتەکانیدا دیارن.

لێکۆڵینەوەکەی ئێمە بریتییە لەلێکۆڵینەوەی شیعرە فارسییەکانی مەحوی لەڕووی سۆفیگەرییەوە ، ئەگەر لەشیعرەفارسییەکانی وردبینەوە ئەو قووڵییە فەلسەفیەی کەلە کوردییەکانی هەیە لەم جۆرەی بەدی ناکرێ و لەگەڵ ئەوەی کە کۆمەڵێ وشە و زاراوەی سۆفیگەریی تێدایە بەڵام هێندەی کوردییەکانی دەوڵەمەند نین و بەزۆری غەزەلەکانی لەقۆناغی گواستنەوەی غەزەلی دلداری ئاساییە بەرە و دلداری ڕاستەقینە و باس لەسەرەتاکانی خۆشەویستی خوایی دەکەن و جاروباریش کەناری دەریای ئەو ئەڤینە بەجێ دێڵن و بەرەو قوڵایی هەنگاو دەنێن.

بەگشتی شیعرە فارسییەکانی مەحوی دەستی نووسەرانی پێڕانەگەیشتووە ئەم کارەی ئێمە هەموو شتێ نییە و تەنیا شەقڵ شکاندنێکە و سەرەتایەکە بۆ لێکۆڵینەوەی فراوانتر.

باسەکە بریتییە لە دوو بەش و ئەنجام و کورتەی باس بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی ، سەرەڕای لیستی سەرچاوەکان .

بەشی یەکەم :–

بریتییە لەدەستنیشانکردنی زاراوە سۆفییگەرییەکان و لەناو ئەوانەشدا زاراوەی حاڵ و مەقامەکان لەبەیتە فارسییەکاندا ، هەروەها بەراوردکردنی زاراوەی حاڵ و مەقامەکان لەگەڵ ئەوانەی کە لەشیعرە کوردییەکانیدا بەکارهاتوون.

بەشی دووەم :–

بریتییە لەدیاریکردنی سەرەتاکانی سۆفیگەری لەشیعرە فارسییەکانی مەحویدا و هێنانەوەی نمونە بۆ ئەم مەبەستە ، هەروەها ئاماژەکردن بەو بەیتانەی بەرەو خۆشەویستی خوایی دەڕۆن و هەڵوەستە کردنێ لەوشوێنانەی کەجار و بار بەرەو قوڵایی سۆفیگەری دەچن ، لەکۆتاییدا هیوادارم کە خزمەتێکی کەمی ئەدەبی کوردیم کردبێ و رۆشناییەکم خستبێتە سەر ئەم لایەنە تاریکەی دیوانی مەحوی.

# بەشی یەکەم

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر مەحوی کراون وا بەدەردەکەوێ کە خەلیفەی شێخ بەهائەدین بووە و دەستێکی باڵای لەهۆنینەوەی شیعری سۆفییگەری هەبووە و سەر بەتەریقەتی نەقشبەندی بووە.

بۆ پشت ئەستوورکردنی ئەم بۆچوونانە دەمانەوێ لەنێوان شیعرە فارسییەکانیەوە ئاماژە و بەو ووشە و زاراوە سۆفیگەریانە بکەین کە لەشیعرەکانیدا هاتوون و لاپەرەکان دەستنیشان بکەین ، هەروەها دەمانەوێ بەراوردێ بکەین لەنێوان ژمارەی ئەو ووشە و زاراوانە لەشیعرە کوردی و فارسیەکاندا و بگەینە ئەو ئەنجامەی کە بزانین کام لەو وشە و زاراوانە لەکوردی و فارسیەکاندا بەکارهاتوون و کامیان تەنیا لە کوردییەکان دان و لەفارسیەکاندا نین ، کامیانیش لە فارسیەکاندا بەکارهاتوون و لەکوردییەکاندا نین.

ئێستاش وا لەخوارەوە بەپێی ئەلفبا وشە و زاراوەکان پۆلێن دەکەین و هەروشەیەك یەك جار ئاماژەیان بۆەکەین لەدیوانی مەحویدا.

| ژ | وشەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١ | أتش | ٤٧٤ |
| ٢ | أيينة | ٤٧٤ |
| ٣ | ايثار | ٤٧٤ |
| ٤ | ابر | ٤٧٩ |
| ٥ | أفتاب | ٤٧٦ |
| ٦ | استغنا | ٤٨٢ |
| ٧ | ازل | ٤٨٢ |
| ٨ | الفت | ٤٨٦ |
| ٩ | اكسير | ٤٨٨ |
| ١٠ | اجل | ٤٩٥ |
| ١١ | اسلام | ٥٠٨ |
| ١٢ | أتشخانة | ٥١٠ |
| ١٣ | احد | ٥١٥ |
| ١٤ | اتحاد | ٥٢٤ |
| ١٥ | بت | ٤٧٨ |
| ١٦ | برق | ٤٨٢ |
| ١٧ | بلبل | ٤٨٣ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | بادة | ٤٨٨ |
| ١٩ | بقا | ٥٠٢ |
| ٢٠ | بازقضا | ٥٠٢ |
| ٢١ | بارگاه | ٥١٩ |
| ٢٢ | پيمانه | ٤٧٣ |
| ٢٣ | پروانه | ٤٧٤ |
| ٢٤ | پيرمغان | ٤٩٣ |
| ٢٥ | تاج | ٤٧٤ |
| ٢٦ | تعظيم | ٤٨٨ |
| ٢٧ | تفرد | ٤٩٥ |
| ٢٨ | توحد | ٤٩٥ |
| ٢٩ | توتيا | ٥٠٠ |
| ٣٠ | جلوة | ٤٧٣ |
| ٣١ | جلا | ٤٧٤ |
| ٣٢ | جذبه | ٤٨٢ |
| ٣٣ | جمال | ٤٨٨ |
| ٣٤ | جلال | ٤٨٨ |
| ٣٥ | جود | ٥٣٥ |
| ٣٦ | چليپا | ٥٢١ |
| ٣٧ | حال | ٤٧٥ |
| ٣٨ | حسن | ٤٧٥ |
| ٣٩ | حيات افزا | ٤٧٨ |
| ٤٠ | حق | ٤٩٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٤١ | حقيقت | ٥٠٦ |
| ٤٢ | خرقة | ٤٧٤ |
| ٤٣ | خاكسار | ٤٧٨ |
| ٤٤ | خورشيد | ٤٨١ |
| ٤٥ | خرابات | ٤٨٢ |
| ٤٦ | خم | ٤٨٦ |
| ٤٧ | خط سبز | ٤٨٨ |
| ٤٨ | خدا | ٤٩٠ |
| ٤٩ | خال | ٥١٠ |
| ٥٠ | خانقاة | ٥١٩ |
| ٥١ | دير | ٤٧٣ |
| ٥٢ | داغ | ٤٧٤ |
| ٥٣ | دل | ٤٧٥ |
| ٥٤ | دنيا | ٤٨٥ |
| ٥٥ | ديوانة | ٤٩٤ |
| ٥٦ | دار البقا | ٥٠٤ |
| ٥٧ | دوزخ | ٥٠٥ |
| ٥٨ | رحمت | ٤٧٨ |
| ٥٩ | روح | ٤٧٨ |
| ٦٠ | رخ | ٤٨٣ |
| ٦١ | رخسار | ٥٢٢ |
| ٦٢ | رموز | ٥٣١ |
| ٦٣ | زندةدل | ٤٨٤ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠٩ | گبر | ٤٩٢ |
| ١١٠ | گیسو | ٥١٠ |
| ١١١ | لعل | ٤٧٥ |
| ١١٢ | لطف | ٤٩٩ |
| ١١٣ | موغبەچە | ٤٧٣ |
| ١١٤ | میکدة | ٤٧٣ |
| ١١٥ | مستانة | ٤٧٣ |
| ١١٦ | میخانة | ٤٧٣ |
| ١١٧ | محبت | ٤٧٥ |
| ١١٨ | مروة | ٤٧٦ |
| ١١٩ | مَلَك | ٤٧٦ |
| ١٢٠ | مقامات | ٤٧٧ |
| ١٢١ | منازل | ٤٧٧ |
| ١٢٢ | منصور | ٤٧٨ |
| ١٢٣ | ماه | ٤٨٢ |
| ١٢٤ | محبوب | ٤٨٢ |
| ١٢٥ | مجذوب | ٤٨٢ |
| ١٢٦ | مِلك | ٤٨٣ |
| ١٢٧ | می | ٤٨٦ |
| ١٢٨ | موج | ٤٩٢ |
| ١٢٩ | مدد | ٤٩٣ |
| ١٣٠ | محراب | ٤٩٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٣١ | مرغ الهی | ٥١٠ |
| ١٣٢ | مخلص | ٥١٢ |
| ١٣٣ | محنت | ٥٢٨ |
| ١٣٤ | نشئه | ٤٧٣ |
| ١٣٥ | نور | ٤٧٦ |
| ١٣٦ | نفس | ٤٨١ |
| ١٣٧ | نقطة | ٤٨٣ |
| ١٣٨ | نقاب | ٥١١ |
| ١٣٩ | نام و نشان | ٥١٤ |
| ١٤٠ | نرگس | ٥٢٢ |
| ١٤١ | وجود | ٤٨٣ |
| ١٤٢ | وطن | ٤٨٤ |
| ١٤٣ | وحشت | ٤٨٦ |
| ١٤٤ | ویرانة | ٤٨٦ |
| ١٤٥ | وحدت | ٤٨٦ |
| ١٤٦ | وصل | ٥٠٩ |
| ١٤٧ | وصال | ٥١٥ |
| ١٤٨ | هجرت | ٤٩٢ |
| ١٤٩ | یار | ٤٧٣ |

بەم جۆرە ژمارەی وشە و زاراوە سۆفیگەرییەکانی شیعرە فارسییەکان گەیشتە (١٤٨) بەرامبەر (٣٥٤) لەبەشە کوردییەکەدا.لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کەمەحوی لەشیعرە کوردییەکانیدا زیاتر زاراوەی سۆفیگەریی بەکارهێناوە نەك لەفارسییەکانی ، بۆیە وای بەچاك دەزانین کە لەخشتەیەکدا لایەنی لێکچوون و جیاوازیی هەردوو بەشە کوردی و فارسییەکە روون بکەینەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو وشە و زاراوانەی لەبەشە کوردییەکە هەن و لەفارسیەکە نین ، زۆرن و ئەگەر تۆماریان بکەین جۆرە درێژداڕییەك و دووبارەکردنەوەیەك نیشان دەدا ، بۆیە وامان لاچاکە ئەگەر خوێنەر ویستی بابگەڕێتەوە سەر سەرچاوەکەی[1].

| وشە و زاراوەی لێکچوو | ئەو وشە و زاراوانەی لەفارسیەکەهەن ولەکوردییەکە نین |
|---|---|
| أفتاب ، أیینە ، الفت ، اجل ، اسلام ، اکسیر | أتش ، ایثار ، ابر ، استغنا . ازل ، أتشخانە ، احد ، اتحاد |
| بت ، بلبل ، برق ، بقا | بادە ، بازقضا |
| پروانە ،پیر مغان | پیمانە |
| تاج ، توحید | تعظیم ، تفرد ، توتیا |
| جذب ، جلا ، جلال ، جمال ، جلوە | جود |
| ------ | چلیپا |
| حال ، حسن ، حق ، حقیقت ، حیات ، افزا | ------- |
| خاکسار ، خال ، خدا ، خورشید ، خط سبز ، خرابات | خرقە ، خانقاە |
| داغ ، دل ، دنیا ، دوزخ ، دیر | دیوانە ، دار ، البقا |
| روح ، رحمت | رخ ، رخسار ، رموز |

| | |
|---|---|
| زلف ، زنده دل | -------- |
| سَحَر ، سراب | سجده‌گه ، سلطان فقر ، سألك |
| شاه ، شور ، شکر ، شوق ، شیدا ، شیخ | شهادت |
| صبح ، صبر ، صفا ، صنم ، طوبی ، طور | طاق ، ابرو ، طلب |
| ظلمت | -------- |
| عزلت ، عشرت ، عرش ، عنقا ، عشق | عدم ، عَلَم |
| غمزه | -------- |
| فقر ، فنا ، فیض | فیوضات |
| کامل ، کُلبه ، کوی ، کعبه ، کمال ، کیمیا | |
| گدا ، گوهر | |
| لطف ، لعل | |
| مرغ ، مغبچه ، مجذوب ، محبوب ، محبت ، مدد ، مستی ، مقام ، منصور ، موج ، می ، میخانه ، میکده ، محراب ، مخلص ، محنت | معراج ، مروه ، ملك ، منازل ، ماه ، مرغ ، الهی |
| نور ، نرگس ، نفس ، نقاب | نشئه ، نور ، نقطة ، نام و نشان |
| وجود ، وحدت ، وحشت ، ویران ، وصال | وطن ، وصل |
| هجرت | -------- |
| یار | -------- |

دوای ئەم بەراورد کردنە بۆمان دەردەکەوێ کە وشەهاوبەشەکان (١٠٠) وشەن ئەوانەی لە بەشە کوردییەکەدا هەن و لەفارسییەکەدا نین (٢٤٠) وشەیەو ئەوانەی لەفارسییەکەدا هەن و لەکوردییەکەدا نین (٤٤) وشە و زاراوەیە.

کەوابوو مەحوی بەگشتی لەرووی روخسارەوە هەمان زاراوە سۆفیگەریەکانی بەشە کوردییەکەیدووبارەکردۆتەوەونزیکەیلە (٣٠ ٪) ی بەشە فارسییەکەی سەربەخۆیە.

ئەمجا بەرەو زاراوەی حاڵ[٢] و مەقامەکانی[٣] شیعرە فارسییەکان دەچین و ئاماژە بەو بەیتانە دەکەین کە تیایاندا بەکارهاتوون.

## زاراوەکانی حاڵ لەشیعرە فارسییەکانی مەحویدا :-

مەحوی لەبەیتێکدا زاراوەی حاڵی بەکارهێناوە و بەیتەکەش لەخۆشەویستی سۆفیانەیە ، بۆ نموونە :

حرف زبان حال تو بشنو بگوش هوش

گوید همیشه شمع بود تاج سربلا[٤]

واتا : تۆ گوێ لە وشەی زمانی حاڵ بگرە بەگوێی هۆش کە دەڵێ : سەری بەڵادار هەمیشە روناکە و تاج ئاسا دەبریسکێتەوە.

مەحوی ئەم زاراوە حاڵانەی خوارەوەی لە شیعرە فارسییەکانیدا بەکارهێناوە:-

١. جذبە : نەمن ازجذبە عشقش چنین أشفتە حال هستم

که این لیلی هزارا ن چو مجنونش بود مجذوب[٥]

واتا : سۆزی عەشقی ئەم لەیلایە هەر تەنیا حاڵی منی نەشێواندووە ، بەڵکو هەزارانی وەکو مەجنونەکەی بۆ خۆی کێش کردووە ، لێرەدا سەرەڕای وشەی (جذبە) ناوی بەرکاریش لێ وەرگرتووە کە (مجذوب)ە.

٢. جمال : بتعظیم جمالت کج کلا هانند گردن کج

با جلال جلالت پادشا هانند گردن کج[٦]

واتا : لەبەر مەزینی جوانیت کڵاولارەکان هەموو مل کەچن ، لەبەر شکۆمەندیی پلە و پایە و توانات هەموو پاشایەکان گەردەن کەچن.

٣. جلال : لەنیوە بەیتی دووەمی بەیتی پێشوو ئەم زاراوەیە بەکارهاتووە ، بەگشتی ئەم دوو زاراوەیە (جمال ، جلال) هەرچەندە لەواتادا پێچەوانەی یەکترن ، بەڵام لەگەڵ یەکتری دێن وەکو (قبض ، بسط).

٤. شوق : (محوی) زتب شوق تو بگداخت خودا ای شمع

امشب بعزا خوانی پروانه بیرون أ[٧]

واتا : مەحوی لەگەرمی عەشقا خۆت بتوێنەوە ، ئەی مۆم ئەمشەو وەرە دەرەوە بۆ سەر خۆشی و پرسە لێکردنی پەروانە.

٥. قرب : أبرورا سوختن خواهم کەخواهم قرب تو

می درخشد نورونار از گرمی خوی شما[٨]

واتا : گەر بمەوێ لێت نزیك بمەوە دەبێ ئابروو و ناو و نیشانی خۆم بسووتێنم ، لەگەرمیی خودی تۆ نوور و ئاگر هەڵدەستێ.

٦. کمال : یك را کمال دادە مالش نمی دهد

یك رابدادە اند بجای کمال مال[٩]

واتا : یەکێ پلە و پایەی تەواویی (کمال) دەدەیتێ و ماڵی نادەیتێ ، یەکێکیش لەجێی کەمال ماڵی پێ دەبەخشی.

٧. محبت : پا باحذر گـذار درین رەتو (محویا)

راه محبت است بلا خفته بربلا[١٠]

واتا : ئەی مەحوی لەم رێگەیەدا پێ بەئەسپایی دابنێ ، رێگای خۆشەویستییە و دەردو بەلا لەباوەشی بەلادا نووستووە.

## زاراوەکانی مەقام لەشیعرە فارسییەکانی موحویدا :

مەحوی لەبەیتێکدا زاراوەی مەقامی بەکارهێناوە بەشێوەی کۆ (مقامات) . هەروەك دەڵێت :

جگر خون گشتن واز خود گذشتن ، خویشتن کشتن

رەعشق است ، دارد این مقامات و منازلها[١١]

واتا : جگەربوون بەخوێن و لەخۆ خۆشبوون و خۆ کوشتن رێگای عەشقە ، کە ئەم هەموو مەنزڵگا و قۆناغانەی هەیە.

ئینجا ئەم زاراوە مەقامانەی خوارەوەی لەشیعرە فارسییەکانیدا بەکارهێناوە :

١. شکر : غلطی بشکر در دهن یار تو عمری است

ای حرف فرومانده بشکرانه بیرون آ[١٢]

واتا : گەر یاری تۆ بەهەڵە ناوی تۆی بەسەر زاردا هات یا تانەیەکی لێدای سوپاسی خوا بکە و بۆتۆ تەمەنێکە ، ئەی وشەی بێ توانا بەسوپاسگوزارییەوە وەرە دەرەوە.

٢. صبر : نقاب از چهره بردار ای جبینت ماه شهر آشوب

زجابر یکدم ازیك برق جلوه صبر صد أیوب[١٣]

واتا : ئەی ئەو کەسەی کە تەوێڵت وەکو مانگی شار شێوێنە دەمامك لەسەر رووت لادە ، گەر لەتۆی ستەمکارەوە یەك چرکە تیشگی جوانیت دەرخرێ ئەوا ئارامی سەد ئەیوبی گەرەکە.

٣. فقر : تنم بی جامه° دردوسرم بی تاج فقر افتد

اگر بدهم بقاقم خرقهء پشمينهء خودرا[١٤]

واتا : ئەگەر واز لەغەرگەی خوریی سۆفیانەم بێنم و بیدەمە قاقوم (کە گیانلەبەرێکی وەکو سمۆرە وایە و پێستەی سپی و بەنرخە) ، ئەوا لەشم بێ بەرگی دەردو سەرم بێ تاجی هەژاری دەمێنێتەوە ، واتا : ئەو غەرگەیە بۆی جل و بەرگ و تاجی سەرە.

دوای ئەوەی زاراوەی حاڵ و مەقامەکانمان دەستنیشانکرد و نموونەمان بۆ هێنانەوە ، بۆمان دەرکەوت کە بەیتەکان لەچوار چێوەی سۆفیگەری و خۆشەویستی سۆفیانە دەخولێنەوە . هەروەها دەبێ ئەوەش ئاشکرا بکەین کە لەشیعرە فارسییەکانیدا (٧) زاراوەی حاڵی بەکارهێناوە بەرامبەر (١٣) زاراوە لەشیعرە کوردییەکانیدا[١٥] ، کەچی تەنیا (سێ ٣) زاراوەی مەقامی لەشیعرە فارسییەکاندا بەکارهێناوە بەرامبەر (١٤) زاراوەی مەقام لەشیعرە کوردییەکاندا[١٦].

# پەراوێزەکانی بەشی یەکەم :-

١. شیعری ئایینی و سۆفیگەری لەشیعرە کوردییەکانی مەحویدا ، ابراهیم احمد ، ل٢٥٥ – ٢١٦ .

٢. حالّ : بەخشیشێکی خواییە و پەیوەندی بەوەرزشی لەش و گیانی قورسەوە نییە و زوو ون دەبێت ، حالّەکانیش ئەمانەن (المراقبة ، القرب ، المحبة ، الخوف ، الرجاء ، الشوق ، الانس ، الطأنينة ، المشاهدة ، اليقين) اللمع فی التصوف ، السراج الطوسی ، ص٦٦.

هەندێ لەنووسەران ئەمانەش بەحالّ دادەنێن (القبض ، البسط ، المحو ، الاثبات ، الصحو ، السکر ، الغيبة ، الشهود ، الوجد ، الجلال ، الجمال ، الکمال ، اللوائح ، الطوالع ، اللوامح ، الجذب ، الوارد) تەصەوف چییە . ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی ، ل٢٩٦.

٣. مەقام : ئەو پلە و پایەیە کە سۆفی بەهۆی وەرزشی لەش و گیانی قورسەوە بەدەستی دێنێ و لەحالّ زیاتر دەوام دەکات ، بەگشتی مەقامەکان ئەمانەن (التوبە ، الورع ، الزهد ، الفقر ، الصبر ، الرضا ، التوکل ، الشکر) . اللمع فی التصوف ، ص٦٥.

٤. دیوانی مەحوی ،چ٢ ، ل٤٧٥.

٥. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٨٢.

٦. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٨٨ .

٧. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٤.

٨. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٦.

٩. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥١٥.

١٠. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٥.

١١. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٧.

١٢. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٣.

١٣. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٨٢.

١٤. سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٤.

١٥. زاراوەکان ئەمانەن (محبة ، رجاء ، شوق ، انس ، یقین ، جلال ، جمال ، کمال ، قبض ، بسط ، صحو ، سکر ، جذب) . شیعری ئایینی و سۆفیگەری لەشعرە کوردییەکانی مەحویدا ، ل ٢٦٣ – ٢٦٧.

١٦. زاراوەکان ئەمانەن (توبة ، ورع ، زهد ، فقر ، صبر ، توکل ، رضا ، شکر ، احسان ، فناء ، بقاء ، توحید ، اخلاص ، صدق) . شیعری ئایینی و سۆفیگەری لەشیعرە کوردییەکانی مەحویدا ، ل ٢٦٨ – ٢٧٢.

# بەشی دووەم

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەشیعرەکانی مەحویمان کردووە ، وای بۆ دەچین کە شیعرە فارسییەکانی بەگشتی دووبارە کردنەوەی شیعرە کوردییەکانێتی لەڕووی ناوەڕۆکەوە ، بۆیە ئەگەر سەیری شیعرە فارسییەکانی بکەین و زۆر بەئاشکرا دەتوانین دەستنیشانی سەرەتاکانی سۆفیگەری لەشیعرە فارسیەکانی بکەین و بەنموونە ئەمە روون بکەینەوە .

بێگومان مرۆڤی سۆفی هەر کە کەڵکەڵەی عەشقی خوای دەکەوێتە سەری بەرەبەرە جیهان ویستی لەبەرچاو دەکەوێ و بەدوایدا هەڵپەناکات. مەحوی لەچەند بەیتێکدا ئاماژە بۆ ئەم حاڵەتە دەکا و لەم دوو بەیتەی خوارەوە نەك هەر جیهان بەهیچ و کەم دەزانێ بەڵکو خۆشی بەهیچ دەزانێ ، چونکە بونێکی هەتاهەتایی نییە و مێوانێکە لێێ.

مەحوی دەڵێت :

گفتا توکمی استی ز کجا تا بەکجایی        گفتم کە منم هیچ ز هیچ آمدە تاهیچ[1]

واتا : بەگاڵتەوە پێی گوتم : تۆ هیچ و بێ سەنگی لەکوێوە بەرەو کوێ دەڕۆی ؟

گوتم : من لەخۆمەوە هیچم و لەهیچەوە هاتوومە و بەرەو هیچ دەڕۆم.

هەروەها لەبەیتێکی تردا دەڵێت :

دنیا هەمە هیچ است ولی هیچ تر ازوی        مایيم کەدر باختە ایم این همە باهیچ[2]

واتا : جیهان هەمووی هیچە و هیچتر لەو ئێمەین کەسامانی گیانی و مادیمان لەپێناو ئەودا داناوە و ئەنجامیشی هەر هیچە.

لەبەیتێکی تر شاعیر ئەوەمان نیشان دەدا کە ئەوەی کوڕی زەمانەیە و بەشوێن چڵێسی جیهان دەکەوێ لەناو گرووپی پیاوچاکاندا بێزراوە.

مەحوی دەڵێت :

ابنای دهر جمله بکردار دهریند بی شك از قبیح نزاید مگر قبیح[٣]

واتا : رۆڵەکانی جیهان بەکردەوەکانیان جیهان پەرستن ، بێگومان شتی پیس هەر پیسی لێ پەیدا دەبێت.

ئەمجارە شاعیر بێ وەفایی جیهانمان بۆ روون دەکاتەوە کە بەقای لەگەڵ کەس نییە ، هەروەك دەڵێ :

ثبات از دهر کم جو چون وفا از روسپی(محوی)

شده شب یارتو ، فردا بدیگرخانه مادامه[٤]

**واتا : جیهان سۆزانی ئاسابێ وەفایە ئەمشەو لەباوەشی تۆیە و بەیانی لەماڵێکی تر کابانە و لەباوەشی یەکێکی ترە.**

**دوای ئەمە بێزاری شاعیر پانتاییەکەی فراوانتر دەبێ و نامۆیی لەخۆشی دەکا و هەمیشە خۆی بەگوناهبار دێتە بەرچاو و بەئومێدی لێبووردنی خوایە ، واتا لەم قۆناغەدا بەرەو تۆبەکردن دەڕوا و بەهیوای ئەوەیە کە خوا لێی ببوورێ و ئەم فەرموودانەی پێغەمبەری (د.خ) لەبەرچاوە (کل بنی أدم خطاء و خیر الخطائین التوابون)[٥] ، یاخود دەفەرموێ (التائب من الذنب کمن لا ذنب له)[٦] .**

لەم بەیتەی خوارەوەدا مەحوی داوا لەخۆی دەکا کە نەکەوێتە داوی نەفسی بەدی ، هەروەك دەڵێ :

مخور فریب باین عنکبوت نفس خسیس

توباز دست شهی چون مگس بەتارمپیچ[٧]

واتا : تۆ بازی دەستی پاشای عەشقی و بەداوی جاڵجاڵۆکە ئاسای نەفسی بەدت هەڵنەخەڵەتێی و خۆت بەداویەوە مەپێچەوە.

بێزاری مەحوی لەنەفسی زیاتر دەبێ و تەمەنی هەموو لەپەرستنی بتی نەفسی خەرجکردووە ، لەم بارەیەوە دەڵێت :

عمرها شدما پرستاربت نفس خوديم

اين چنين عمر تو چون زلف بتان برباد باد[٨]

واتا : تەمەن رابردوو و ئێمە خەریکی پەرستنی بتی نەفسی خۆمانین ، ئەم جۆرە تەمەنە با وەکو زوڵفی جوانان بدرێتە بەر با ، واتا : هەرنەبێ بەم پێیە شاعیر کە تێدەگات زۆربەی تەمەنی لەبەدکاریدا رابردووە و دان بەگوناهەکانی خۆیدا دەنێت و بەڵام نا ئومێدیش نابێ ، چونکە مرۆڤی باوەڕ پتەو دەبێ لەنێوان بیم و تکادابێ و دەست لەخۆی بەرنەدات (قل ياعبادي الدين أسرفوا على انفسهم لاتقنطوا من رحمةالله ان الله يغفر الذنوب جميعاً)[٩]، لەم رووەوە مەحوی دەلێت :

اگر چه روسيه از معصيت هستم تو غفارى باين جسم نزار و نالهاى زارما رابخشن[١٠]

واتا : ئەگەر چی لەبەر زۆریی گوناه رووم رەشبووە بەڵام ئەی خوایە تۆلێبووردەی دەسا بمبوورە بۆ خاتری لەشی بێهێزم و ناڵە و زاریم.

هەر لەم بارەیەوە دەڵێت :

بضاعت نبودم جزخامكارى و گنهبارى تو يارب پس بجاه احمد مختار مارابخش[١١]

واتا : جگە لەبەدکاری و گونەهکاری هیچ کاڵایەکم بەدەستەوە نییە ، دەسا خوایە بۆ خاتری پێغەمبەر (د.خ) بمبەخشە.

ئەم دووبەیتەی خوارەوەش هەر لەم تەوەرە دەخولێنەوە و شاعیر خۆی بەگوناهبار دەزانێ و داوای بووردن و بەخشینی خوا دەکات ، بەشی دووەمی

هەردوو بەیتەکان دووبارەی یەکترن جگە لەگۆڕینی راناوی لکاوی (ت) لەبەشی یەکەم بە (م) لەبەیتی دووەم :

باصد قصور باز بدربارت أمدم	بارم گنه بحضرت غفارت أمدم[١٢]

از غافر وغفور گذشته است کارمن	بارم گنه بحضرت غفارم أمدم[١٣]

مەحوی نامەی کردەوەی خۆی پێ رەشە ، بۆیە لەداخاندا هەر خەریکی گریە وزارییە و گوێڕایەڵیی ئەم ئایەتە دەکا (فليضحكوا قليلاً وليبكوا كثيراً جزاءاً بما كانوا يكسبون)[١٤]،لەم بارەیەوە دەڵێت :

ای دل بروی زردهمه اشك سرخ ریز	خواهی گرت سفید شود نامەو سیاه[١٥]

واتا : ئەی دڵ فرمێسکی خوێناوی بەسەر رووی زەردا بڕژێنە ، ئەگەر دەتەوێ نامەی کردەوەی رەش سپی بێت.

مەحوی لەگەڵ ئەم هەموو گوناهانەوە ورەی بەرنەداوە و چاوی لەرەحمەتی خوایە و دڵنیایە لەوەی کە هەر کەسێ بەدڵێکی پاکەوە بەرە و بارەگای بێ وێنەی خوایی بگەڕێتەوە دەرگای لەسەر داناخرێت ، چونکە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ (لما خلق الله الخلق كتب في كتابه فهو عنده فوق العرش ان رحمتيى تغلب غضبي)[١٦]،بێگومان ئەو بەزەییەی خوا بۆ خۆی داناوە (٩٩) جار بەقەد بەزەیی هەموو بوونەوەرانە ، هەروەك لەم حەدیسەدا نیشان دراوە (جعل الله الرحمة مائة جزء فأمسك عندة تسعةً و تسعين وأنزل في الارض جزءاً واحداً ، فمن ذلك الجزء تتراحم الخلائق حتى ترفع الدابة حافرها عن ولدها خشية أن تصيبة)[١٧].

لەم روانگەیەوە مەحوی پەرتەوی خۆشەویستی خوایی پەڕیوەتە دەروونی و بەشوێن ئەم پەرتەوەدا هەنگاو دەنێ و لەپێناویدا چەند ئازار بچێژێ و هیلاك

ببیّ هێشتا هەر لای کەمە و تاوای لێهاتووە خۆشی و ناخۆشی لا یەکسان بووە و هەرچی لەلای یارەوە بۆی بێت خۆشە ، لەم بارەیەوە دەڵێت :

جفایش راصفا دانم ، بلایش مرهم جانم

ز محبوب دل و جان ، أنچە می أید بود محبوب[18]

واتا : ئازار دانت لام بێگەردییە ، بەلآت مەڵحەمی گیانمە ، لەدولبەری دڵ و گیانەوە هەرچی بێت ئەوە خۆشە.

رێگای مەحوی رێگای عاشقانە و لەو پێناوەدا زۆر ئازار دەچێژێ و بەرگە دەگرێت ، هەروەك دەڵێت :

بیابان هلاك و كوەغم در راە دارد عشق

كە دروی چندها مجنون وصدها كوهكن گم شد[19]

واتا : رێگای عەشق پڕی بیابانی کوشندە و کێوی خەمە ، لەو رێگایەدا چەندەها مەجنوون و کێو هەڵکەن (فەرهاد) گوم بوون.

دڵدار لەپێناو دلبەریدا دەبێ بسووتێ و پەروانە بکاتە پێشڕەوی خۆی و وانەی عەشقی لێ فێربیت ، دوورنییە مەحوی لەم بەیتانەدا بەم بەیتەی سەعدی شیرازی کاریگەر بێت کە لەبارەی خۆشەویستی و خۆبەختکردنی پەروانە دەڵێت :

ای مرغ سحر عشق ز پروانە بیاموز کان سوختە راجان شدو أواز نیامد[20]

واتا : ئەی باڵندەی بەیانیان لەپەرەوانە فێری عەشق بە ، کە خۆی دەسووتێنێ و گیانی دەردەچێ و دەنگی لێوە نایێ.

بەم جۆرە مەحوی هەنگاو بەهەنگاو لەعەشقەکەیدا تۆختر دەبێ و دەیەوێ وەکو پەروانە بسووتێ تا لەگەڵ یاردا تێکەڵ ببێ و لەناو بوونیدا بکەوێتە حاڵەتی نەمانەوە ، مەحوی لەم بەیتەی خوارەوە داوا دەکا کە خۆشەویستی لەپەروانە وەرگرێ و دەست بەرداری نەبێ ، وەك دەڵێ :

علم عشق از خضرت پروانه (محوی) یادگیر

برمدار اصلامگر از سفرةء آزاد زاد[21]

واتا : مەحوی تۆ زانستی خۆشەویستی لەپەروانە وەرگرە ، هەمیشە دەست بەرداری ئەو زادە گیانییە مەبە کە لەخوانە ئازادەکەی ئەو دەستت دەکەوێت ، لێرەدا پەروانەی وەکو پیرێکی تەریقەت داناوە کە خاوەنی سفرە و خانەقا بێ ، لەم بەیتەشدا شاعیر بولبول و پەروانە دەکاتە مامۆستای خۆی و دەیەوێت زانستی عەشقیان لێ فێربێت کە زۆر لەو زانستانە بەرزترە کە بەخوێندن فێری دەبیت ، بێگومان ئەمەش زانستی خواییە و دەدرێتە تایبەتەکانی خوا هەروەکو درایە خدری زندە (وعلّمناه من لدنا علماً)[22]، هەر لەبەر ئەمەشە کەڵە سۆفییەکان هەندێ جار گاڵتە بەزاناکانی شەریعەت دەکەن چونکە زانستیان لەزاناکان وەرگرتووە کە دەمرن ، بەڵام خۆیان زانستیان لەیەکێ وەرگرتووە کە نامرێ.

مەحوی دەڵێت :

از بلبل و پروانه بیاعشق بیا موز برتربود این علم ز تعلیم وتعلّم[23]

واتا : وەرە زانستی عەشق لە بولبول و پەروانە فێربە ، ئەم فێربوونە زۆر بەرزترە لەفێربوون بەخوێندن و خوێندەواری.

هەر لەبارەی پەروانە و سووتانیەوە دەڵێت :

(محویا) پروانه پیر کاملی است سوختن هرسالکی رادین بود[24]

واتا : مەحوی پەروانە پیرێکی کامڵی تەریقەتە ، هەرموریدێ پێویستە لەسەر ئایینی ئەو بێ و وەك ئەو خۆی بسووتێنێ .

بەم جۆرە پەروانە لەلای مەحوی پیرێکی کامڵە ، واتا : وەکو قوتب وایە و پێویستە گوێڕایەڵیی بکرێت و سووتان ببێتە ئایینی رێبواری سۆفیگەری ، ئەم

سووتانەش ئەو پەری خۆبەختکردنی عاشقە و هەنگاونانە بەرەو مەحو و بوونەوە و نەمان ، ئەمەش لەگەڵ سۆفیەکانی بەر لەخۆی وەرگرتووە و ئیبن عەرەبی لەم رووەوە دەڵێت :

أدین بدین الحب انی توجه ست رکائبه فالحب دینی و ایمانی[٢٥]

مەحوی بە چاوێکی فەلسەفیانەوە دەڕوانیتە گەردوون و بە ناتەواو دێتە بەر چاوی چونکە یەك لەسەر سەدی خۆشەویستیی خوای تێدایە(٩٩)بەشەکەی تری لەو دیو جیهانی هەستییە ،بۆیە ئەو بەشەی گەردوون کە خۆشەویستیی تێدایە وەکو دانەو ئەویتر وەکو کایە و با دەبیات هەروەك دەڵێت:

درخر من کائنات کردم نگاه چندانکه بخوشه خوشه اش بردم راه

دیدم بکنه کار چون پی بردیم یکدانه محبت است و باقی همه کاه

واتا : کە سەیری خەرمانی بوونەوەرانم کرد و ئەوەندەی پەیم بە ڕێگەی هێشووەکانی برد،هەر کە پەیم بە راستی و نهێنی کارەکە برد ، زانیم کە ئەو خەرمانە یەك دانە خۆشەویستیی تێدایە و ئەویتر هەموو کایە.

جا یەکێ ببێتە مەردی مەیدانی خۆشەویستی خوایی ، عەشقەکە دەچێتە ناو خوێنیەوە و لە پێناویدا خۆی بەخت دەکاو هەمیشە ملکەچی فەرمانی یارە و بە قەد سەرە موویێ لانادات ،لەم بارەیەوە چەند بەیتێکی مەحوی تۆمار دەکەین .

یارب تو مراباتن پر زخم بمیران برژنده ببر،خرقەو بی پینه حرام است(٢٧)

واتا:خوایە تۆبە لەشی پڕ برینەوە بم مرێنە و هەمیشە کۆنە پۆشم و غەرگەی بێ پینەم لە خۆم حەرام کردووە ،هەر لەم بارەیەوە دەڵێ :

(محوی) بسوزو خود بکش و غوگە زن بخون دان امتحان محبت بود فسیح(٢٨)

واتا:مەحوی بسووتێ و خۆ بکوژە و خەلتانی خوێن بە چونکە مەیدانی تاقیکردنەوەی خۆشەویستی گەورە و فراوانە .

ئەمجارە مەحوی داوا لە یاری بکوژی دەکا کە هەر هیچ نەبێ نیوە کوژراوی بکا تا لە دەفتەری خۆشەویستانی خوادا ناوێکی دەبێ بۆیە دەڵێ :

توای قاتل کرم کن نیم بسمل ساز (محوی) را

میان سرکشانش شایدش خوانند گردن کچ(٢٩)

واتا:ئەی یاری بکوژ لەرووی بەخشینەوە مەحوی نیوە کوژراو بکە تا لە نێوان سۆفیە گەورەکاندا شایەنی ئەوە بێ بە ملکەچ و گوێڕایەڵ بخوێندرێتەوە .بەڵام لەم بەیتەی خوارەوەدا بە نیوەی کوژراوی قایل نابێ و دەیەوێ بگاتە پلە و پایەی شەهیدبوون:

شهادت انتظارا نیم (محوی) جمله جان برکف

براهش ایستاده تادم تیغش چه فرماید (٣٠)

واتا: مەحوی چاوەڕوانی شەهیدبوونەو گیانی لە ناو لەپێتی ، ئەوە لەسەر رێگا وەستاوە و تا بزانێ دەمی تیغت چ فەرمانێ دەکا.

مردن لە پێناوی یار ، (خوا) شەهیدبوونە ، شەهید بوون واتا هەمیشە ئامادە و گەیشتنە ژیانی هەتا هەتایی .مەحوی خۆی دەخاتە بەردەمی تیغی یار تا لەبەر چاوی ئەهلی جیهان وون دەبێ و بەرەو نەمان دەچێ و پێ دەنێتە ژیانی سەرمەدی ، لەم رووە وە کۆمەڵە بەیتێکی تر هەن کەوا لە خوارەوە دەخرێنە بەرچاو :

شهادت راتو خواهی ، کشتەو ابروی شوخی شو

دم تیغ فناجو ،جلوەو اب بقا بنگر(٣١)

واتا:گەر شەهیدبوونت گەرەکە ببە کوژراوی شمشێری برۆی شۆخێ ،لە دەمی تیغی نەمان بگەڕێ و سەیری پرتەوی ئاوی مان بکە ، بەرای مەحوی سۆفی تا نەمرێ و نەگاتە حاڵەتی نەمان پێ نانێتە دەروازەی مان، هەرلم بارەیەوە دەڵێ:

ای بسته کمر بقصد قتل سرما امر تو بود مطاع و حکم تورروا(۳۲)

واتا: ئەی ئەو یارەی کەمەرت بەستووە بۆ کوشتنی ئێمە ،چ فەرمانێ دەدەیت و چ حوکمێ دەکەی ئێمە گوێڕایەڵ و ملکەچین.

هەر لەم بارەیەوە مەحوی گوێڕایەڵی خۆی بۆ یارەکەی دەردەخا و چاوەڕوانی دەستووری یارە و ملی لە موێك باریکترە بەرامبەر تیغەکەی ، هەروەك دەڵێ :

آورده ام اینك سرخود ماه رخا اخر تو بفرماو بکش تیغ وبیا(۳۳)

واتا: هەر ئێستا ئەی یاری رووی وەك مانگ سەری خۆم هێناوە ، دەسا تۆ فەرمانێ بدە و تیغت هەڵکێشە و وەرە .

عاشق هەمیشە دەبێ لە ژیانی جیهاندا خۆی بە مردوو بزانێ و نەکەوێتە داوی جیهانپەرستیەوە و هەردەم بار و بارگەی بەستراو بێ و ئامادی ئەو سەفەرە دوور و درێژە بێت کە هەزارانی وەکو ئەو زەنگیان بۆ لێدراوە و ئەوانەی دوای ئەمانیش بە رەمزی ((انتم السابقون ونحن اللاحقون))(۳٤) وەڵامیان داوەتەوە: (محویا) گوید برمز ((السابقون السابقون))(۳٥)

زنده بخت أن کس که زود أمد بدنیا مرد ورفت (۳٦)

واتا: مەحوی بە رەمزی ئایەتی (السابقون السابقون ) واتا: ئەو یەکتاپەرستانەی کە بە تەواو خوایان ناسیوە و لە ناو بوونی خوادا فانی بوونە هیچ زمانێ ناتوانێ وەسفیان بکا و دوای فانی بوونیان لە نزیکترین پلەی نزیکین لە خوا ، ئەو جۆرە لەبەخت زیندووەکانن بەلای مەحوییەوە بەخت زیندوو ئەو کەسەیە کە زوو هاتۆتە جیهان و مردووە و گەیشتۆتە خزمەت خوا.لەم رووە وە مەحوی دەڵێ:

از زنده دل سخن شنو زنده دل کسی است

خود را شمرده مرده و بر خویشتن گریست (۳۷)

واتا: ئەگەر گوێ لە دڵ زیندوو بگری ،دڵ زیندوو کەسێکە کە خۆی بە مردوو دادەنێ و هەمیشە ناڵە و زارێتی واتا مرۆڤی سۆفی هەمیشە حەزی لە باڵا بوونی گیانیە و دەیەوێ بەرەو جیهانی باڵافرکە بکا و لە کۆتی زنجیر ی جیهانی ناسووت رزگاری بێت ، بۆیە هەر بۆ حاڵی خۆی دەگری و چاوی بە فرمێسکە ، چونکە چاوێك گەر لە ترسی خوا فرمێسکی رشت دۆزەخ نایسووتێنێت هەروەك پێغەمبەر فەرموویەتی ((عینان لا تمسهما النار ،عین بکت من خشیة الله وعین باتت تحرس في سبیل الله))(٣٨) .مەحوی یەکێ بووە لە سۆفیەکانی نەقشبەندی (٣٩)ئەم تەریقەتەش سەرەتا بە سۆز (جذبة) دەست پێدەکا تا دەگاتە قۆناغی گەیشتنە خوا ،لەم بارەوە دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی محەممەدی کوڕی بەهائەددین دەڵێ((بدایتنا نهایة الطرق الآخری))(٤٠)  مەحوی لە عەشقی خوا بە سۆز دەستی پێکردووە و ئەوە روون دەکاتەوە کە هەر خۆی نییە گیرۆدەی ئەم عیشقە بووبێ و کەوتبێتە ئالۆزیەوە بەڵکو ئەم لەیلایە–شاعیرە سۆفیەکان زۆر جاران رەمزی مێیینە بۆ خوا بەکاردێنن و لەشێوەی کچێ پێیدا هەڵ دەڵێن– هەزارانی وەکو مەجنوونی کێش کردووە و گیرۆدەی داوی ئەوینی کردوون ، هەروەك دەڵێت :

نه من از جذبه عشقش چنین اشفته حال هستم

که این لیلی هزاران چومجنونش بود مجذوب(٤١)

کەواتە ئەم لەیلایە (٤٢)هەزارانی وەکو مەحویی تووشی داوی عیشق کردووە و کێشی کردوون ،دوای ئەمە مەحوی دەیەوێ وەکو مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە عەشقەکەیدا هەڵس و کەوت بکا ووڵات بە جێ بێڵێ و روو لە بیابان بێ ،چونکە مەولانا لەپێناو تەریقەتدا بەرەو هیند رۆیشت و چەند بیابانی بڕی و دوایی گەڕایەوە کوردستان و هەر لەو پێناوەشدا دووبارە کوردستانی بەجێ

هێشت و بەرەو شام ڕۆیشت و هەر لەوێش سەری نایەوە، لەم رووەوە مەحوی دەڵێت:

(محویا)گر خالدی مشرب شدن خواهد دلت

خالد اسا شوتو هم دیوانەو صحرا نورد(٤٣)

واتا:مەحوی گەر دڵت دەیەوێ خالد ئاسا بی ، تۆش وەکو ئەو ببە گەڕیدەی چۆڵ و بیابان.

مەحوی وەکو نەقشبەندییەك تێگەیشتووە  کە داب و نەریتی خۆشەویستی خوایی دەبێ بە نهێنییەوە جێبەجێ بکرێ بە تایبەتی زیکر کردن ،چونکە زیکری نهێنی لە ئاشکرا خێرترە،لەم بارەیەوە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمووێ ((یفضل الذكر على الذكر بسبعين ضعفا اذا كان يوم القيامة رجع الله الخلائق و جاءت الحفظة بما حفظوا و كتبوا ،قال الله تعالى انظروا اهل بقى لعبدي من شيء ، فيقولون ما تركنا شيئا مما علمناه و حفظناه الا وقد احصيناه و كتبناه ،فيقول الله تعالى :ان لك عندي حسنا وانا اجزيك به و هو الذكر الخفى)) (٤٤)،لەم بەیتەی خوارەوەدا مەحوی پێمان ڕادەگەیەنێ کە هاوو هوو کردن لە زیکردا ناتەواوییە :

خاموشی است داب محبت کەمی کشان

از خامی است (محوی) اگر هاو هو کنند(٤٥)

واتا:داب و نەریتی خۆشەویستی خوایی لە بێ دەنگیدایە،ئەوانەی هاوو هوو دەکەن و دەنگیان بەرز دەکەنەوە لە بێ ئاگایی و ناتەواوییانە مەحوی.

دوور نییە مەبەست لە زیکر کردنی بە نهێنی هەر ئەوە بێ کە ئەو راز و نیازەی لە نێوان دڵدار و دولبەردا هەیە بڵاو نەبێتەوە بۆیە لە کۆنەوە پیاو چاکانی ڕێگای عەشقی خوایی هەوڵی ئەوە دەدەن ئەو رازە نەدرکێنن و لەو

بەشە مەعنەوییە دەست بەردار نەبن .لە لایەکی تر نابێ پیاوچاکان ئەگەر بەشێکیان لە پێشبینی و کەرامەت پێدرا جاڕی بۆ بدەن،بەڵکو دەبێ بیشارنەوە نەخۆ تووشی داوی پیسی ڕیا بێن و بەرەو هەڵدێر بچن.مەحوی لەم بەیتەی خوارەوە حەیف و مەخابن بۆ ئەوە دەخوا کە ئەشکی خوێناویی نهێنییەکەی ئاشکرا کردووە :

راز مستور شداز سرخی توفاش ای اشك

ماجرا ها برخ زرد من اوردی حیف(٤٦)

واتا:ئەی ئەشکی خوێنینم لە سایەی تۆوە رازی داپۆشراو و نهێنیم لا ئاشکرا بوو،مخابنە ئەو هەموو کارەساتەت بەسەر ڕووی زەردی مندا هێنا.

مەبەستی سۆفی لە عەشقەکەی گەیشتنە یارە (خوا)، مەحوی بەرەو قووڵایی ئەو عەشقە دەچێ و بەهەشتی ئاسایی موسڵمانی ناوێ،بەڵکو بەهەشتی گەیشتنە یاری دەوێ ، واتا:کە بەهەشتی گەرەکە بۆ بینینی خوایە نەك بۆ خواردن و خواردنەوە((وجوه يومئذ ناضرة الى ربها ناظرة))(٤٧)لەم بارەوە دەڵێ:

بدین ما بهشت اصل نبود جز بهشت وصل

بدل حاشا بخواهم حور و جنت خواهم از توتو(٤٨)

واتا : بە ئایینی ئێمە جگە لە بەهەشتی گەیشتنە خوا بەهەشتی پڕ حۆری و پەری ئەسلی نییە ،حاشا دڵی من بەهەشتی حۆرییانی ناوێ و هەرتۆم دەوێ لە تۆ،ئالێرەدا مەحوی دەچێتەوە سەر بیر و باوەڕەکەی ئیبن عەرەبیکە خۆشەویستیی خوایی بووەتە ئایینی و لە پێناوی تێ دەکۆشی هەروەك دەڵێ:

ادین بدين الحب انى توجه ت ركائبه فالحب ديني و ايماني(٤٩)

دوای ئەوە مەحوی دەیەوێ وەکو دڵۆپێکی ئاو لە دەریای خۆشەویستیی خودا گوم بێ و بتوێتەوە بۆ ئەوەی یەکێتیەك پێك بێ لە نێوان خودی خۆی و خوادا،واتا تا مەحوو نەبێتەوە و نەگاتە نەمان ناتوانێ بگاتە یەکبوون .مەحوو بوونەوە یەکێکە لە حاڵەکان و بریتییە لە نەمانی سیفەتی ئادەمی و گۆڕنەوەی بە سیفەتە خواییەکان تا ئەمە نەبێ هەرگیز یەکبوون مەحاڵە و هەر دوو دووە ،بۆ نموونە مەحوی دەڵێ:

نگردی تا چوه قطره محودر دریای عشق دوست

محال است اتحادت تا ابد یك یك بود دو دو(٥٠)

واتا:تاوەکو دڵۆپێ لە دەریای عەشقی یار مەحوو نەبێتەوە،هەتا هەتایە یەکبوونت زەحمەتە و هەر لەگەڵ ئەو دوو بە دوو دەمێنیتەوە.

بەم شێوەیە دەبینین مەحوی کەناری خۆشەویستیی خوایی بە جێ دێڵێ بەرەو قووڵاییەکەی پێ دەبزێوێ،بەیتی راڕابردووش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەو رایەمان،چونکە دەیەوێ وەك چۆن لەسەرەتا دڵۆپێ بووە لە دەریای بوونی خوادا ئاواش بگەڕێتەوە بۆ ئەم دەریایە و تێیدا بتوێتەوە.

بۆ ئەوەی زیاتر ئەم بابەتەمان لا بەرجەستە بێ ،هەوڵ دەدەین چەند نموونەیەکی تر بخەینە بەرچاوی خوێنەرانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

ئەگەر سەیرێکی ئەم غەزەلەی مەحوی بکەین هەر لە سەرەتاوە تا بنە تالە لە جیهانی سۆفیگەری دەدوێ و جار و بار بەرەو مەقامەکانمان دەبا و پشت بەو ئایەتانە دەبەستێ کە لە تەوەرەی یەکتاپەرستی دێن و دەچن.مەحوی لەم غەزەلەیدا روو لە رابەرەکەی دەکا و بە هاوسەری دڵی خۆی دادەنێ و وای بۆ دەچێ کە تێکەڵی دڵی بووە و وەك ئەوی لێهاتووە ، سەرەتا دەڵێ:

بیالین دل از روی تفقد　　　　بیامد یار لیك امد چو دل شد(٥١)

واتا هەر که یار بۆ سەردانی سەرینی دڵ هات ،لە هاتنەکەی یەکبوونی (اتحاد)پەیدا کرد و وەکو دڵی لێهات و ئاوێتەی بوو.

جا مەحوی سەری لە خۆی سور دەمێنێ و نازانێ چۆن گەدایەکی وەکو ئەو بووەتە هاونشینی پاشایەکی وەکو یار و گەیشتۆتە مەقامی (تفرد) واتا–هەمیشە وەستانی ئەو رێبوارە بە خوا و ئامادە بوونی خوا لە دڵی–لێرەدا یەکبوونەکە زیاتر تۆخ دەبێ و نزیکییەکەی دەگاتە رادەی ئەم ئایەتە((ونحن اقرب الیە من حبل الورید))(٥٢)بۆیە مەحوی سۆفیی دەڵێ:

گدایی همچو من چون همنشینی کند با ان شە تخت تفرد(٥٣)

واتا:گەدایەکی وەك من کە دەبێتە هاونشینی ئەو شایەی کە خودان تەختی تەفەرودە .بەم پێیە رابەرەکەی مەحوی گەیشتۆتە مەقامی (تفرد) و مەحویش لە ناو بوونی رابەرەکەیدا تواوەتەوە و (الفناء في الشیخ)یەکبوونێکی پەیدا کردووە لە گەڵ بوونی خوادا تێکەڵ بووە.

دوای ئەمە رابەرەکەی لە بیابانی (توحد)(٥٤) بە جێی دێڵێ،ئەو بیابانەی کە هەموو رێبوارێ سەرەدەریی لێ دەرناکا و وێڵی دەبێت لەم رووە وە مەحوی دەڵێت:

گـذشت اە او مرا بگـذاشت باصد توحش در بیابان توحد
کنم پیش سلیمان حال خود عرض ببندم نالەرا بابال هدهد(٥٥)

واتا:ئەو تێپەڕی و بەسەر شێواوییەوە منی لە بیابانی (توحد) بەجێهێشت،یا بە وێڵی و سەرگەردانییەوە جێی هێشتم، بۆیە ناڵە ناڵی خۆم لە نامەیێ دەنووسم و لە باڵی پەپووە سلێمانەی دەدەم و سکاڵای خۆم بۆ رابەرەکەم دەنێرم (کە وەکو حەزرەتی سلێمانە لە مەزنیدا).

پاشان مەحوی بەرەو راستیی کارەکە دەچێ و بە دڵی خۆی رادەگەیەنێ کە تا بە تەواوی واتای(ایاك نعبد) بە کردەوە جێ بە جێ نەکرێ با چاوەروانی ئەوە نەبێ کە خوا بە (اهدنا الصراط المستقیم) لەو بیابانەدا رزگاری بکا و بەرەو ئاوەدانیی جیهانی مەعنەوی بباو بیگەیەنێتە یاری راستەقینە.واتا ئەو کاتە رێبوار دەگاتە راستە شەقامی بارەگای خوایی هەر کە هەموو پەرستنەکانی بۆ خوابێ و هیچ هاوبەشییەکی نهێنی و ئاشکرای تێکەڵ نەبێت ، لەم حاڵەدا رێبوار هەموو بوونی دەداتە دەست خوا و ویستی خۆی تێکەڵی ویستی خوا دەبێت:

مدار از (اهدنا)چشم اجابت چوداری غش تودر (اياك نعبد)(٥٦)

واتا:ئەوەی لە پەرستنی خوادا پاکی نەنوێنێ و دوور نەبێ لە هەموو ریایێ.با چاوەروانی ئەوە نەبێت کە خوا رێگای راستی نیشان بدات.

هەر کە پەرستن هەر تەنیا بۆ خوا بوو ((الا لله الدين الخالص))(٥٧)رێبوارێ سەری لە رێگای خوادا بەخت دەکا و کڕنۆش بۆ بارەگای یەزدانی دەبات،بەم پێیە کڕنۆش بردن نزیکترین حاڵەتی رێبوارە لە خوا ،بۆیە مەحوی داوا لە خۆی دەکا کە هەر لە کڕنۆش بردن بێ بۆ ئەوەی بەردەوام لە خوای نزیک بێت:

برا هش سرگـذار و پای او بوس نجوشد(واقترب)(٥٨) الاز (واسجد)

واتا:سەرت لە سەر رێگای یار دابنێ و پێی ماچ بکە ،چونکە نزیکیت لە خوا جۆش ناسێنێ تەنیا لە حاڵەتی کڕنۆشدا نەبێ.

ئیبن عەرەبی لە لێکدانەوەی ئایەتی (و اسجد و اقترب)دا دەڵێ:–واسجد– کڕنۆشی نەمان (فناو)بەرە لە نوێژی ئامادەگی ،ئینجا لێی نزیك بەوە و لە کردەوە و سیفەت و خودی مەحوو ببەوە تاکو لە ناو خودی ئەودا دەگەیتە مانی دوای نەمان(البقاء بعد الفناء)(٥٩).

لە کۆتاییدا مەحوی موژدە دەداتە خۆی کە یار بەڵێنی کوشتنی پێداوە — مەبەست لە کوشتن مردنە مردن سەرتای گیانییە و مزگێنی بە یەزدان گەیشتنە ((و عجلت الیك رب لترچی))(٦٠)بۆیە مەحوی باڵی پێوە رسکاوە و بۆ بارەگای بەرزی خوا فڕیوە:

پريدە روح(محوی)از بشارت بقتلش تاتو بنمودی تعهد(٦١)

واتا:مەحوی موژدەی کوژرانی پێدراوە لەلایەن یارەوە بۆیە گیانی لە پەرواز دایە و چاوەڕێی ئەوەیە کە بە لێنەکەی جێ بە جێ بکات.

لە کۆتایی ئەم غەزەلەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مەحوی هەرچەندە سەرەتای عەشقەکەی لە تەوەری رابەری تەریقەتەکەیدا خول دەخواتەوە و دەگاتە پایەی نەمان لە رابەردا ،هەر لە رێگای ئەم نەمانەوە نزیکی خوا دەبێ و بەرەبەرە دەچێتە قووڵایی عەشقەکەوە تا بە تەواوی دەیەوێ ئەو پەردەیە لاچێ کە لە نێوان خۆی و خوادا هەیە و گیانی بە باڵە فڕکە بەرەو پانتایی ئەو ئاسمانە لە شەققەی باڵ بدات.

# پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١-دیوانی مەحوی ،چ٢،مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس،ل٤٩٠.

٢-سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩٠.

٣- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩١.

٤- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٢٧.

٥-التاج الجامع للاصول في الأحاديث الرسول،ج٥،ص١٥١.

٦-فيض القدير،ج٣،ص٢٧٦.

٧-دیوانی مەحوی ،ل٤٨٩.

٨- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩٣.

٩-الزمر-٥٣.

١٠-دیوانی مەحوی،ل٥٠٤.

١١- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٠٥.

١٢- سەرچاوەی پێشوو،ل٥١٦.

١٣- سەرچاوەی پێشوو.ل٥٣٦.

١٤-التوبه-٨٢.

١٥-دیوانی مەحوی،ل٥٢٥.

١٦-التاج،ج٥،ص١٥٦.

١٧- سەرچاوەی پێشوو،ل١٥٦.

١٨-دیوانی مەحوی،ل٤٨٢.

١٩- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩٦.

٢٠-کليات سعدی،محمد علی فروغی،ص٦٨.

٢١-دیوانی مەحوی،٤٩٤.

٢٢-الكهف-٦٥.

٢٣-دیوانی مەحوی،ل٥١٨.

٢٤- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٠٠.

٢٥-ترجمان الٲشواق،ابن عربی،ص٤٤.

٢٦-دیوانی مەحوی،٥٣٨.

٢٧- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٨٣

٢٨- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩٢.

٢٩- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٨٩.

٣٠- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٠٠.

٣١- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٠٢.

٣٢- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٢٣.

٣٣- سەرچاوەی پێشوو،ل٥٢٣ .

٣٤-لە كاتی سەردانی گۆڕستان دەگوترێ.

٣٥-الواقعە-١٠.

٣٦-دیوانی مەحوی،ل٤٨٥.

٣٧- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٨٤.

٣٨-التاج،ج٤،ص٢٣٦.

٣٩-بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نامەی دكتۆرای -ابراهیم احمد حسین(شیعری ئاینی و سۆفیگەری لە شیعرە كوردییەكانی مەحویدا)،ل٢٧٣-٢٧٥.

٤٠-الحدیقة الندیة في الطریقة النقشبندیة،ص١٦.

٤١-دیوانی مەحوی،ل٤٨٢.

٤٢-بەکارهێنانی ڕەمزی مێ بینە بۆ عەشقی خوایی مێژوویەکی کۆنی هەیە ،میسرییە کۆنەکان(ئیزیس)خوداوەندی دایکیان پەرستووە و (مریم)لە مەسیحیەتدا بووەتە (وعاء الكلمة) و پێش ئیسلام لە دوورگەی عەرەبیدا باوەڕیان وابوو کە فریشتەکان کچی خوان-بەڵام قورئان بەرپەرچی ئەمەی دایەوە-بەم جۆرە تێکەڵییەك پەیدا بوو لە نێوان غەزەلی عوزری و غەزەلی سۆفییانە،سەرەتاکانی ڕەمزی ئافرەت لە شیعری عارفانە بۆ (قيس بن ملوح) دەگەڕێتەوە شیعرەکانی لە غەزەلی عوزرین و خۆشەویستیی ئاسمانی و زەویی ئاوێتە کردووە و خۆی لە چێژی هەستی پاراستوە و بەرەبەرە بەرەو خواییەکە چووە.الرمز الشعري عند الصوفية ،د.عاطف جودت ،ص١٢٥-١٢٨.

هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێ لە کەڵە سۆفیەکان جوانیی خوا لە ناو جوانیی ئافرەتێکدا بەرجەستە دەکەن و پێیدا هەڵ دەڵێن،هەروەکو ئیبن عەرەبی لە شاری مەککە تووشی عەشقی (نظام) بوو بەهۆیەوە بەرەو عەشقە راستەقینەکە رۆیشت،واتا:لە عوزرییەکەوە بۆ خۆشەویستیی عارفانە وەرچەرخایەوە.

٤٣-دیوانی مەحوی،ل٤٩٥.

٤٤-البهجة السنية في اداب الطريقة العلية الخالدية ،محمد بن عبدالله الخاني،ص٣٧-٣٨/السعادة الأبدية فيما جاء به النقشبندية،عبدالمجيد بن محمد الخاني،ص٢٨.

٤٥-دیوانی مەحوی،ل٤٩٩.

٤٦- سەرچاوەی پێشوو،ل٥١١.

٤٧-القيامە-٢٢.

٤٨-دیوانی مەحوی،ل ٥٢٣ .

٤٩-ترجمان الأشواق،ابن عربي،ص٤٤ .

٥٠-دیوانی مەحوی،ل٥٢٤.

٥١- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩٦ .

٥٢-ق-١٦ .

٥٣-دیوانی مەحوی ،ل٤٩٦ .

٥٤-یەکێکە لە مەقامەکانی سۆفیگەری و بریتییە لە ((بوونی تەواو ،بە یەکزانینی دەرکەوتنی خوا،یەك گوتن و یەك کردن))ە خواجە ئەبو عەبوڵڵای ئەنساری دەڵێ((تەوحید پاککردنەوە و دورخستنەوەی خوایە لە هەموو تازە پەیدا بوێك)).فرهنگ لغات و اصگلاحات و تعبیرات عرفانی ،ص١٤١.

٥٥-دیوانی مەحوی ،ل٤٩٦ .

٥٦- سەرچاوەی پێشوو،ل٤٩٧ .

٥٧-الزمر-٣ .

٥٨-العلق - ١٩ .

٥٩-تفسیر القرأن الکریم ،ج٢، ابن عربی ،ص٨٢٩-٨٣٠ .

٦٠-طه-٨٤ .

٦١-دیوانی مەحوی ،ل٤٩٧.

## ((ئەنجام))

دوای تەواو بوونی ئەم باسەی کە بە ناونیشانی ((شیعرە فارسیەکانی مەحوی لە روانگەی سۆفیگەرییەوە))یە توانرا ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی لێ هەڵبهێنجرێ :

١-مەحوی لە شیعرە فارسیە کانیدا ١٤٩ وشە و زاراوەی سۆفیگەریی بە کارهێناوە و ئەگەر لە گەڵ کوردییەکانیدا بەراورد بکرێ دەگاتە نیوەی کوردیەکانی.

٢-وشە و زاراوە هاوبەشەکان لە نێوان کوردیەکان و فارسیەکان -١٠٠-وشەن و ئەوانەی لە فارسیەکە هەن لە کوردیەکە نین -٣٨-وشەن،ئەوانەی لە کوردیەکە هەن و لە فارسیەکە نین -٢٤٦- وشەن.

٣-مەحوی -٧-زاراوەی حاڵی لە فارسیەکان بە کار هێناوە بەرامبەر -١٣- زاراوەی حاڵ لە کوردیەکانی،هەروەها -٣-زاراوەی مەقامی لە فارسیەکان بە کارهێناوە بەرامبەر -١٤- زاراوە لە کوردیەکانی.

٤-سەرەتاکانی سۆفیگەری لە شیعرە فارسیەکانیدا بە ئاشکرا دیارە و بریتین لە بە کەمزانینی جیهان و بێزاری لە نەفسی خۆی و پەشیمان بوونەوە لە گوناهەکانی و داوای لێبوردن لە خوا .

٥-دوای ئەمە بەرەو خۆشەویستی خوایی هەنگاوی ناوە و ئازاری لە پێناوی عەشقەکەیدا چەشتووە و پەروانەی کردۆتە نموونەی رابەری کامڵی خۆی .

٦-هەوڵی ئەوەی داوە چاو لە مەولانا خالیدی نەقشبەندی بکا و بیابان بگرێتە بەر بۆ گەران بە شوێن رابەری تەواودا.

٧-لە عەشقەکەی بەرەو قوڵایی دەچێ و بەهەشتی بۆ ئەوە دەوێت کە خوای تێدا ببینێت نەك لەبەر حۆری و خۆشیی ئەو بەهەشتە.

٨-لە چەند بەیتێکدا هەست بە توانەوە و نەمان لە شێخدا (الفناو فی الشیخ)دەکرێ و هەروەها بەرەو یەکبوون دەچێ لەگەڵ بوونی خوادا.

٩-شیعرە فارسیەکانی بەقەد کوردیەکانی بەرەو لایەنی فەلسەفیی سۆفیگەری ناچن.

# ( سەرچاوەکان )

**کوردییەکان**

١–تەصەوف چییە ،ئەمینی شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی ،دار الحریە للگباعە و النشر ،بەغدا،١٩٨٥.

٢– دیوانی مەحوی ،چ٢،مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەد مەلا کریم،چاپخانەی ئۆفێستی حیسام،بەغدا ،١٩٨٤.

٣–شیعری ئاینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردیەکانی مەحویدا،نامەی دکتۆرا،ابراهیم احمد حسین،زانکۆی سەلاحەددین،ئاداب،١٩٩٦.

**عەرەبیەکان**

٤– البهجة السنية في اداب الطريقة العلية الخالدية ،الشيخ محمد بن عبدالله الخاني،استانبول ،تركيا،١٩٩٢ .

٥–التاج ،الجامع للأصول في احاديث الرسول،ط٤،الشيخ منصور علي ناصيف ،دار الفكر ،بيروت،١٩٧٥ .

٦–ترجمان الأشواق ،ابن عربي ،دار صادر بيروت ،للطبعة و النشر،١٩٦١.

٧–تفسير القرآن الكريم ،ابن عربي ،ط٢،دار الأندلس للطباعة و النشر ،بيروت ،١٩٧٨.

٨–الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية،محمد بن سليمان النقشبندي ،استانبول–تركيا–١٩٩٢ .

٩–الرمز الشعري عند الصوفية ،ط١،د.عاطف نصر ،دار الأندلس –بيروت،١٩٧٨.

١٠-السعادة الأبدية فيما جاء به النقشبندية ،مكتبة الحقيقة ،استانبول-تركيا-١٩٩٢.

١١-فيض القدير شرح الجامع الصغير،ط١،عبدالرؤوف المناوي ،مصر-١٩٣٨.

١٢-اللمع في التصوف ،السراج الطوسي،تحقيق :عبدالحليم محمود،مصر-١٩٦٠.

فارسیەكان

١٣-فرهنط لغات و اصطلاحات و تعبيرات عرفانى،چ٢،سيد جعفر سجادى،كتابخانه و گهورى،تهران-١٣٥٤.

١٤-كليات سعدى ،محمد على فروغى،نشر طلوع،چاپخانەی آينده-١٣٧٤.

# کاریگەریی مەحوی لەسەر سەید ئەحمەدی نەقیب و حەمدی دا

## پێشەکی

(مەحوی)[1] بەچینی دووەمی شاعیرانی قوتابخانەی بابان دادەنرێ و لە شیعرە ئایینی و بیروباوەڕییەکانیدا (العقائد) پێشڕەوی شاعیرانی دوای خۆی بووە و خۆشی لە قەسیدەی بەحری نووردا کەمێك کەوتۆتە ژێر کاریگەریی شیعرەکانی (نالی)یەوە بەتایبەتی قەسیدە ئاینییەکەی:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا، هەتاکەی حیرصی وێرانە
لەگەڵ ئەم عەشقبازانە بڕۆ بازانە، ئازانە[2]

کاریگەریەکەش لە روخسارو ناوەڕۆکدا خۆی دەنوێنێ، لەڕووی روخسارەوە لەسەر هەمان کێش و سەروای قەسیدەکەی نالییە، لەناوەڕۆکیش بابەتی هەردووکیان ستایشکردنی پێغەمبەرە و (د. خ) بۆ نموونە تەنیا یەك خاڵ لەم رووەوە نیشان دەدرێ و ئەویش بریتییە لە دەرخستنی ئاکاری پێغەمبەر (د. خ)، نالی دەڵێ:

موردام زیللەت و پارانەوەی حاڵە: نەوەك نەعتە
بەچەن بەیتێکی کوردانە، کە قورئانت ئەناخوانە[1]

---

1 – ناوی مەلا مەحەمەدی کوڕی مەلا عوسمانی باڵخییە و لەدەوروبەری ١٨٣٠ – ١٨٣٦ لەدایکبووە، لای باوکی خوێندویتی و بۆ خوێندن چووەتە ئێران و لە بەغدا لای موفتی زەهاوی ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە.

لە ١٨٦٢ بووەتە ئەندامی دادگا لە سلێمانی. لە ١٨٨٣ چووەتە حەج، یەکێ بووە لە ڕێبوارانی تەریقەتی نەقشبەندی و لە ١٩٠٦ وەفاتیکردووە و لەخانەقاکەی خۆی لە سلێمانی نێژراوە.

دیوانی مەحوی، مودەریس. ل ٥ – ٧.

- دیوانی نالی، مودەریس. ل ٤٨٢.

نالی سەرەڕای ستایشەکە، شانازیش بەزمانی کوردی دەکا کە شایانی ئەم مەقامەی هەیە، بەهەمان شێوە (مەحوی) ئەم بۆچوونە دووبارە دەکاتەوە:

چ قابیل من بەصەد بەیتێکی کوردی صەد هەزار ئەسرار

بدەم شەرح و بەیانی کەم لەگەڵ ئەم عەقڵی نوقصانە[2]

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە مەحوی وەکو ڕێبوارێکی تەریقەتی نەقشبەندی و مەلایەکی هەقگۆ و چاکەخوازێکی شاری سلێمانی ناوی دەرکردبوو، قەسیدە ئایینی و بیروباوەڕییەکانی لەناو مەلایەکاندا ناوبانگی دەرکردووە و شاعیرانی چینی سێیەم وەکو (سەید ئەحمەدی نەقیب) [3] و (حەمدی ساحێبقران)[4] شوێن پێیان هەڵگرتووەو لەڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆکەوە چاولێکەریی شاعیرە کوردەکانیان کردووە. بێگومان ئەمەش کارێکی ئاسایی

---

1- سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٧.

2- دیوانی مەحوی، مودەریس، ل ٤٥١.

3- ناوی سەید ئەحمەدی کوری سەید ئەحمەدی گڵە زەردییەو لە ١٨٦٣ لەسلێمانی لە دایکبووە، لەلای گەلێ لە زانا مەزنەکانی خوێندوەو تا لەلای شێخ مستەفای موفتیی کوری بابا ڕەسولی بەرزەنجی ئیجازەی وەرگرتووە، لەدوای مردنی باوکی لەشوێنی ئەو بووەتە مەلاو لە شازدەساڵیدا کراوەتە نەقیبی سلێمانی.

لە ١٩٠٣ چووەتە ئەستەمبوڵ و لەلایەن سوڵتان و کوردەکانی ئەوێ ڕێزی لێگیراوە، لە ١٩٠٤ گەڕاوەتەوە سلێمانی، لە ١٩١٠ چووەتە حەج و لەوێ نەخۆشکەوتووەو لەشاری مەدینە بەخاك سپێردراوە (دیوانی سەید ئەحمەدی نەقیب، مەحموود ئەحمەد مەحەمەد، ل ١١ - ١٦.

4- ناوی ئەحمەد بەگی کوڕی فەتاح بەگی ساحێبقرانە، لە ١٨٧٨ لەسلێمانی لەدایکبووە، نازناوی شیعری (حەمدی) بووەو هەر لە منداڵییەوە حەزی لە شیعر کردووەو مستەفا بەگ کوڕی مامی بووەو سالم ئامۆزای باوکی بووە.

لە بزووتنەوەکەی شێخ مەحموودا ئازاری دیوەو هەموو سامانی لەو پێناوەدا خەرجکردووە و مرۆڤێکی بە هەڵوێستبووە، لە ١٩٣٦ وەفاتی کردووە و لەگردی سەیوان نێژراوە.

دیوانی حەمدی، نامەخانەی گەلاوێژ، ل ٥ - ٩.

بووە لەژیانی شاعیران و پلەو پایەیانی کەم نەکردۆتەوە، بەڵام هێندە هەیە نابێ شاعیری چاولێکەر کت و مت فۆتۆکۆپیی شاعیرە چاولێکراوە کە بێ و بەڵکو دەبێ جۆرە داهێنان و خستنەسەرێکی هونەریی هەبێت، بۆیە دەتوانرێ بگوترێ کە حەمدی لە سەید ئەحمەدی نەقیب سوار چاکتربووە لەو مەیدانەدا خۆ هەرچەندە (نەقیب) لەهەموو چاولێکەریەکانیدا لەیەك ئاست نەبووەو هەندێکی لە هەندێکی سەرکەوتووتر بووە، لەگەڵ ئەوەشدا نەگەیشتۆتە پلەی حەمدی.

ئەم لاساییکردنەوەیە لەڕووی ڕەخنەی ئەدەبییەوە دەکەوێتە خانەی هاوتاکردنەوە (موازنە) و بەراورد نییە چونکە بەیەك زەمانن، مەبەست لەم لێکۆڵینەوەیەش دەرخستنی ڕووی گەشی تواناو بەهرەی شیعریی مەحوییە کە چۆن بووەتە سەر مەشقی کۆمەڵێ لە شاعیرانی دوای خۆی و لێکۆڵەر تەنیا ئەم دوو شاعیرەی هەڵبژاردووە، جگە لەمانەش کۆمەڵی شاعیری تر هەن کە هەمان ڕێچکەیان گرتۆتەبەر. لەمانەش مەلا محەمەدی خاکی و بێخود، لێکۆڵینەوەکەش دەبێتە دوو بەش:

بەشی یەکەم: بریتییە لە هاوتاکردنی سەید ئەحمەدی نەقیب و مەحوی، لێرەدا بەیتە لێکچووەکان بەرامبەر دەکرێن و لەڕووی روخسارو ناوەڕۆکەوە لێکچوونەکان دەستنیشان دەکرێن.

بەشی دووەم: حەمدی لەگەڵ مەحوی بەرامبەر دەکرێ و بەزۆری جەخت لەسەر هەدوو غەزەلی (شەوڕۆژ) دەکرێ، واتا: ئەو دوو غەزەلەی کە لەدیوانی هەردووکیان کۆتاییان بە وشەی (شەو و ڕۆژ) هاتووە.

بەهیوای ئەوەی خزمەتێکی بچووك پێشکەشی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی کرابێ و هاندانێك بێت بۆ بەدواداچوونێکی دیکە.

# بەشی یەکەم

وادیارە باری کۆمەڵایەتی لەسەردەمی (نەقیب)دا هێندە جیاوازی لەگەڵ سەردەمی مەحوی نەبووە، چونکی (شاعیرمان مەحوی ئاسا دەرگای زۆر داب و نەریتی کۆمەڵی کوتاوە و بەتایبەتی هی وشکە سۆفی و گۆلکە شێخ و هەرزە نەفامەکانی ئەو ڕۆژگارە، هەردەم خەریکی کوتانەوەی سەرو گوێلاکیان بووە)[1].

بۆچوونێك لە ئارادایە کە نەقیب لەڕووی مەبەستی شیعرییەوە ((بەزۆری شوێن نالی و مەحوی و خاکی کەوتووە))[2]، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە بە پلەی یەکەم لە شیعرە ئایینی و بیروباوەڕییەکانیدا (العقائد) بە مەحوی کاریگەرەو ڕێچکەی ئەوی گرتۆتەبەر، لەگەڵ ئەوەش زۆر تێیدا سەرکەوتوو نەبووە. لەسی غەزەل و دوو قەسیدەدا کاریگەرییەکە زیاتر بەرچاو دەکەوێ و تاك و تەراش لەشوێنی تردا چەند لێکچوونێ دێنە بەرچاو.

(نەقیب) لە غەزەلی (گەورەیی شەو بەسەر ڕۆژدا)[3] بیرۆکەو روخساری لە غەزەلەکەی مەحوی (شەو کەسێ پرسی...)[4] وەرگرتووەو هەمان کێش و سەروای دووبارە کردۆتەوە، لەڕووی ناوەڕۆکەوە نیوەی غەزەلەکەی پەیوەندی بەغەزەلەکەی مەحوییەوە هەیە هەروەك لەخوارەوە ئاماژەی پێ دەکرێ:

---

1- دیوانی سەید ئەحمەدی نەقیب، لێکۆڵینەوەی مەحموود ئەحمەد، چاپخانەی ئیرشاد بەغدا، ١٩٨٥، ل ٤.

2- سەرچاوەی پێشوو، ل ٦.

3- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١.

4- دیوانی مەحوی، ج٢، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، چاپخانەی ئۆفیستی حسام، بەغدا، ١٩٨٤، ل ٢٥٦.

* لە بەحری رەمەلی هەشتیی مەحزووفە (فاعیلاتن فاعیلاتن فاعیلاتن فاعلن).

**نەقیب:**

جێی نیازو ناز و رازی حەزرەتی جانانە شەو

وەقتی نازڵبوونی فەیزو ڕەحمەتی سوبحانە شەو[1]

**مەحوی:**

هەر لە تاریکیی شەوایە ڕێ درێ ئەهلی نیاز

رازی دڵ ئیفشا بکەن، خەڵوەتگەهی خاسانە شەو[2]

لەهەردووکیاندا شەو کاتی دەرکەوتن و درکاندنی رازی نێوان خواو بەندەیە، چونکە لە شەودا هەر تایبەتەکان بە ئاگان.

**نەقیب:**

جێی نیازو نازو رازی حەزرەتی جانانە شەو

وەقتی نازلبوونی فەیزو ڕەحمەتی سوبحانە شەو[3]

**مەحوی:**

تیرەگی وا فەضلی بۆ نادەم بەسەر ووناکییا

مەنشەئی ئیظهاری جیلوەی فەیضی سوبحەینانە شەو[4]

نەقیب و مەحوی باسی دەرکەوتنی فەیزی بەیانیان دەکەن، چونکە وا باوە کە ڕەحمەتی خوا لەو کاتەدا شەپۆڵ دەدات.

---

1- دیوانی نەقیب. ل ٤١.

2- دیوانی مەحوی، ل ٢٥٩.

3- دیوانی نەقیب، ل ٤١.

4- دیوانی مەحوی، ل ٢٥٩.

**نەقیب:**

**شەو ئەگەر نەبوایە ڕۆژ ئەم قیمەتەی کەی دەست دەکەوت**

**دوڕو و مرواری لە دەریای ئەخضەرا تابانە شەو[1]**

**مەحوی:**

**هەر سیا بەختانی عیشقە مەظهەری نووری هودان**

**شەو نەبێ ئەستێرە مەستوورن، بەکەم مەڕوانە شەو[2]**

**هەردووکیان باسی بەهای شەو دەکەن، چونکە لە شەودا ئەستێرە دەردەکەوێ گەر شەو نەبوایە، ڕۆژ بێ نرخ دەبوو.**

**نەقیب:**

**شەو ئەگەر نەبوایە ڕۆژ ئەم قیمەتەی کەی دەست دەکەوت**

**دوڕو و مرواری لە دەریای ئەخضەرا تابانە شەو[3]**

**مەحوی:**

**هەر کەسێ طالب بە دوڕی مەعریفەت کۆکردنە**

**پڕ لە دوڕ دەریایەکی بێ مەهلەکەی خنکانە شەو[4]**

**لەهەردوو نیوە بەیتەکەدا شەو بووەتە کانگای دوڕی خواناس و دەریایەکە مەلەوانانی خوا تێیدا مەلە دەکەن و دەگەنە کەناری ڕزگاری.**

---

1- دیوانی نەقیب، ل ٤١.

2- دیوانی مەحوی، ل ٢٥٧.

3- دیوانی نەقیب، ل ٤١.

4- دیوانی مەحوی، ل ٢٦٠.

**نەقیب:**

**بۆ کەسێ قەدری ئاشنا بێ (لیلە القدر)ی بەسە[1]**

**شەو کە میعراج و ظهوری بەحری نووری تیا بووە[2]**

**مەحوی:**

**هێندە صاحێب سیڕە میعراج و شەوی قەدر و بەرات**

**خاصە جاتی ئەون و مومتازە بەم ئەسرارانە شەو[3]**

**لەم دوو نیوە بەیتەی نەقیب و نیوە بەیتی یەکەمی مەحوی باسی میعراج و شەوی قەدر دووبارە بۆتەوە کە هەردووکیان لەشەودا ڕوویان داوە.**

**نەقیب:**

**با لەشەودا دز، دزیی خۆشی بکا وەك گورگی هار**

**وەقتی زاری و تاعەت و پاڕانەوەی پاکانە شەو[4]**

**مەحوی:**

**وەك (خضر) ئاوی حەیاتی فەیضی حەق عافێتیە**

**ئەو خودا پێداوە (مەحوی) تا سەحەر نالانە شەو[5]**

**لایەنی لێکچوون لەوەدایە کە شەو دەمی پاڕانەوە و نالاندنی خواناسانی خاسە.**

**نەقیب:**

**شەو ئەگەر نەبوایە کەی دەستی دەدا وسڵی حەبیب**

**خێری تاعات و عیباداتیشی بەدوو چەندانە شەو[1]**

---

1- دیوانی نەقیب، ل ٤١.

2- دیوانی نەقیب، ل ٤١.

3- دیوانی مەحوی، ل ٢٥٩.

4- دیوانی نەقیب، ل ٤٢.

5- دیوانی مەحوی، ل ٢٦٠.

**مەحوی:**

تێ بگە بۆچی بە جانن طالیبی شەو عاشقان

نیوە شەو بوو وەعدە گاهی هاتنی جانانە شەو[٢]

لەهەردوو نیوە بەیتەکەدا دولبەر، بەشەو بۆ لای دڵدار بەڕێ دەکەوێ دولبەریش خوایەو دڵدار پێغەمبەر (د. خ)، ڕووداوو کاتی ژووانیش شەوی میعراجە

*　　　　*　　　　*

نەقیب لە غەزەلێکی تردا کەوتۆتە ژێر کاریگەریی غەزەلێکی مەحوی کە بەگشتی باسی نالەباری و کە چ ڕەفتاریی چەرخ و زەمانە دەکا کەناکەس لەسەر شانۆی ژیانەو ماقوڵانیش لێکەوتوون.

لەڕووی ڕوخسارەوە هەردوو غەزەلەکە لەسەر یەك کێشی عەرووزی عەرەبین (مفاعین/٤)*، لەڕووی سەرواوە هەردووکیان دوا ـ سەروایان هەیەو بە (دەدوێ ئەدوێ) کۆتاییان دێت.

**نەقیب وەستایانە سوودی لە غەزەلەکەی مەحوی وەرگرتووە و بەزەقی هەست بە چاولێکەرییە کە ناکرێت، ئەگەر بەوردی هەندێ بەیتی لێ بەراورد بکرێ ئەوا ناڕاستەو خۆ جۆرە لێکچوونێك دێتە بەرچاو، بۆ نموونە:**

نەقیب:

دەبینم شاکە ئێستاکە لە کونجی عەز لە تاماتە

بەکۆڵێ جەهلەوە جاهیل لەگەڵ (أبن الحجر) ئەدوێ[٣]

---

[1]- دیوانی نەقیب، ل ٤٢.

[2]- دیوانی مەحوی، ل ٢٥٩.

* – لەبەحری هەزەجی هەشتی تەواوە.

[3]- دیوانی نەقیب، ل ٩٤.

مەحوی:

دەبینم شێری شێر ئەفگەن دەڵەك كەوڵی دەكا، دەبیەم

بەكوڵی كلكەوە ڕێوی لەگەڵ كەوڵی دەڵەك دەدویٚ[1]

زەمانەی سوفلە پەروەر وارە واجی سوفلەیی داوە

كە دایم ئەودە مەسوێرە لەگەڵ نان و نمەك دەدویٚ[2]

بەیتەكەی (نەقیب) زیاتر پەیوەندی لەگەڵ بەیتی یەكەمی مەحوی هەیە هەردووكیان باسی بێ دەسەڵاتیی پایە بەرزان دەكەن بەدەست ناكەسانەوە، لەگەڵ ئەمەش بەیتی دووەمی لە دووڕیانی ناكەس پەروەرییەوە دەگەنە یەكتر.

نەقیب:

عەجەب وەقتێكە خەلقی هەر لە ئاشووب و زەرەر ئەدویٚ

شەو و ڕۆژ هەر لە كینەو بوغز و ئیفساد و لەشەڕ ئەدویٚ[3]

مەحوی:

یەكی تێدا ڕەقیب ئەو شۆخە كوشتنمی كەلێ پرسی

ئیرادەی كاری خێر ئەڵبەتتە شەیتانی لەفەك دەدویٚ[4]

هەردوو بەیتەكە بەگشتی باسی ئەوە دەكەن كە خەڵكی ئەو سەردەمە هەر لە ئاژاوە نانەوە دەگەڕێن و چاویان بەچاكە هەڵنایێ.

*     *     *

---

1- دیوانی مەحوی، ل ٣١٢.

2- سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٤.

3- دیوانی نەقیب، ل ٩٤.

4- دیوانی مەحوی، ل ٣١٤.

(نەقیب) لە قەسیدەیەکی (٥٤) بەیتیدا چاوی لە قەسیدەی بەحری نووری مەحوی کردۆتەوەو لەڕوخسارو ناوەڕۆکدا پێی کاریگەربووە، لەلایەنی روخسارەوە لەسەر هەمان کێش و وسەروای قەسیدەکەی مەحوییە، لەناوەڕۆکیش لە (١٤) بەیت سوودی لە مەحوی وەرگرتووە، (نەقیب) هەر لەسەرەتاوە چاو لەمەحوی دەکات بە دەستەواژەی (وصلی الله علی) قەسیدەکەی دەڕازێنێتەوە:

(نەقیب:

(وصلی الله علی) زاتێ کە قورئانی ثەنا خوانە

لە جوملەی موعجیزاتی ئەو وەلی ئایاتی سوبحانە[1]

مەحوی:

(وصلی الله علی) ئەو حەزرەتەی ساحێب کەمالاتە

کە ئەعلا موعجیزەی، قوربانی بم من، نووری قورئانە[2]

لەهەردوو بەیتەکاندا کۆمەڵێ وشە دووبارە بوونەتەوە (وصلی الله علی، قورئان موعجیزە)، سەرەڕای ئەمەش قورئان وەکو پەر جوێکی پێغەمبەر (د. خ) نیشان دراوە.

نەقیب:

شەهەنشاهی سەریری (لی مع الله) واسیتەی ئیمکان

ڕەسووڵی ئینس و جانە، ئونسی جانە بەحری ئیحسانە[3]

---

1- دیوانی نەقیب، ل ٥٢.

2- دیوانی مەحوی، ل ٤١٩.

3- دیوانی نەقیب، ل ٥٢.

مەحوی:

کە وقتێ ئال و یارانی لە خدمەتیا دەبن وەك ڕۆح

حەیاتە، نووری چاوە، ئونسی جانە، مەحضی ئیحسانە[1]

لەهەردوو بەیتەکەدا بەشێوەیەکی شایان ستایشی پێغەمبەر (د. خ) کراوەو کۆمەڵێ ئەدگاری نایابی بۆ نووسراوە، لەڕوخساردا (ئونسی جانە) دووبارە بۆتەوەو (ئیحسانە) سەرەڕای دووبارە بوونەوەی بووەتە سەروای هەردوو بەیتەکە، بەیتەکەی نەقیب ئاستی هونەریی خۆی ون نەکردووە و شێوازو دارشتنێکی پتەوی هەیە.

نەقیب:

شەوی میعراجی وەك سوبحی هیدایەت پاك و نوورانی

شەوێ بوو تاقیامەت سەد هەزاران ڕۆژی قوربانە[2]

مەحوی:

لەزەرفی یەك نەفەسدا شەو هەزار ئەندەر هەزاران ساڵ

زیاتر بەڵکی ڕێ تەی کات و ڕیجعەت کاهەر ئەو ئانە[3]

لەهەردووکیان ئاماژە بە پیرۆزی شەوی میعراج کراوەو ئەو شەوە خێرو بەراتی بەقەد هەزاران هەزار شەو هەیە، ئاستی هونەریی بەیتەکەی نەقیب لە مەحوی کەمتر نییە، خۆ ئەگەر سەرەتا بە (صلی الله علی) دەستی پێنەکردایەو لەسەر هەمان کێش و سەروا نەبوایە هەست بەوە نەدەکرا کە لەژێر کاریگەریی مەحوی دایە.

---

1- دیوانی مەحوی، ل ٥٤.

2- دیوانی نەقیب، ل ٥٤.

3- دیوانی مەحوی، ل ٤٣٥.

نەقیب:

لەسەر بەحسی (أو أدنی)دا بلێ چی بەندەیی (أدنی)

گەیشتە لامەکان و هاتەوە جێی خۆی هەر ئەو ئانە[1]

مەحوی:

عورووجی ئەجمەدی تا لامەکان و شەمسی جانانە[2]

زیاتر بەڵکی ڕێ تەی کات و ڕیجعەت کا هەر ئەو ئانە[3]

عەجزی بەیتەکەی نەقیب لەگەڵ هەردوو نیوە بەیتەکەی مەحوی لەدوو لایەنەوە پەیوەندارە، یەکەم لەبارەی ئەوەی کە پێغەمبەر (د. خ) لەشەورۆیینەکەیا گەیشتە ئەو دیو شوێن (لامکان)، دووەم گەشتەکەی زۆر کەمی پێچوو و یەکسەر گەڕایەوە و وشەی (ئانە) وەکو سەروا دووبارە بۆتەوە، داڕشتنەکەی نەقیب کوردانە ترەو دەڵێ (هاتەوە جێی خۆی هەر ئەو نانە) بەڵام مەحوی دەڵێ (ڕیجعەت کاهەر ئەو نانە).

نەقیب:

هەزار ئەندەر هەزار ئەسرارو ئاساری کرا تەعلیم

لە پەنجا نوێژەوە بۆی هاتە سەر ئەم پێنج فەرزانە[4]

مەحوی:

لەظە رفی یەك نەفەسدا شەو هەزار ئەندەر هەزارانساڵ[5]

---

1- دیوانی نەقیب، ل ٥٥.

2- دیوانی مەحوی، ل ٤٣٥.

3- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣٥.

4- دیوانی نەقیب، ل ٥٥.

5- دیوانی مەحوی، ل ٤٣٥.

لەڕووی واتاوە لەیەکتری ناچن، تەنیا لێکچوون لەدووبارە کردنەوەی (هەزار ئەندەر هەزار)ە.

نەقیب:

بەچاوی سەر خودای بینی بەبێ تەشبیهو کەیفیەت

قسەی فەرموو لەگەڵیا نەك بە حەرف و صەوتی خۆمانە[1]

مەحوی:

بەچاوی سەر خودا بینە، بەچاوی دڵ خودا زانە[2]

نەقیب هەمان بیرۆکەی مەحوی دووبارە کردۆتەوە کە خوا بینینە بەچاوی سەر، مەحوی زوو دەیبڕێتەوە و پێ لە نەزانی خۆی دەنێ و هەر هێندە دەزانێ کە پێغەمبەر (د. خ) بەچاوی ئاسایی خوای دیتووە، بەڵام نەقیب زیاتر جۆری بینینە کە ڕوون دەکاتەوە کەبێ لێکچوون و چۆنێتی بووە.

ئەم مەسەلەی بینینی خوایە کێشەی زۆر لەسەرە، ئایا خوا لەم جیهانە یا لەو جیهان دەبینرێ؟ بەپێی بۆچوونی قورئان خوا لەم جیهانە بەچاوی ئاسایی نابینرێ ((لاتدركه الابصار وهو يدرك الابصار)) [3]. هەروەها لە قورئاندا هاتووە کە لەڕۆژی دواماییدا پیاو چاکان خوا دەبینن ((وجوه يومئذ ناضرة الى ربها ناظرة)[4]، کەچی مەحوی و نەقیب لەو باوەڕەن کە پێغەمبەر (د. خ) لەشەو ڕۆیینەکەیدا خوای دیتووە، چونکە کارەکە خۆی لەخۆیدا پەرجووە، کەواتە دیتنەکەش جۆرە پەرجوێکە. نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە هەندێ لەو باوەڕەن

---

1- دیوانی نەقیب، ل.

2- دیوانی مەحوی، ل ٤٣٧.

3- الانعام، ل ١٠٣.

4- القیامە، ل ٢٢.

بەهیچ شێوەیێ خوا بەچاوی ئاسایی نابینرێ، چونکە لەشێوەی نییە (لیس کمثله شئ))[1].

نەقیب:

چ بەحرێکی عەمیقە کوللی بەحری تیا کولەو حەیران
چ بەحسێکی دەقیقە خاریجی تەفسیرو تیبیانە[2]

مەحوی:

بە (مافیها)یەوە هەرچی هەیە عیلمی کورەی نۆ چەرخ
بەقەترێکی بزانە، دیدەکەم، لەو بەحری عەممانە[3]

نەقیب باسی شەو ڕۆیینەکە دەکاکە دەریایەکی بێ پایانەو کەس ناتوانێ بگاتە ناخی، بەڵام مەحوی لەبارەی دەریای ئەو زانستە خواییەوە دەدوێ کە فێری پێغەمبەر (د. خ) کرا، بەم پێیە بەیتەکان یەکدەگرنەوە.

سەرەڕای ئەمەش بەیتەکەی نەقیب لەلایەکی تر پەیوەندیی بەم بەیتەی خوارەوەی مەحوی هەیە:

کە هەر سیرێکی عەقلی کول تیا کول مایەوە (بالکل)
کەهەر سیرێکی صەد عاریف تیامە دهۆش و حەیرانە[4]

لێرەدا نەقیب وشەی (کول، حەیران)ی لێ وەرگرتووە و - واتاکەشیان لەیەکترەوە نزیکە کە سەرسوڕمانە لەو شەو ڕۆیینە.

---

1- الشورا، ل ١١.

2- دیوانی نەقیب، ل ٥٦.

3- دیوانی مەحوی، ل ٤٣٧.

4- دیوانی پێشوو، ل ٤٥٢.

لەم بەیتەش مەحوی خۆی بە کاتی ئێستا دەبەستێتەوە و کاتەکەش نێرینەی بەهارە ،جا چ بەهاریچاو بێ یان بەهاری دڵ،خەم بۆئەوە دەخوات کە لە کیس بچێ و جاریکیدی نەیبینێتەوە،دوور نییە مەحوی لە حاڵی سۆفیانەی خۆیدا بێ و بەهاری دڵی هەمووبوونەوەری شین کردبێت .شینەکەشی بۆ ئەوەیە نەخۆ ئەو حاڵە چاووترووکانێ بێ و بە دیی نەکاتەوە ،ئەمەش خۆی لە خۆیدا نامۆییە کی زەمانی سۆفیانەیە:

بەهارێکی کە داخۆبێ،نەیێ،هەی بێن وشینێ کەین

فەلەك هەر شینە ،سەحراشینە ،کێو ولێوی جۆ شینە /٢٨٢٧

مەحوی لە خۆشەویستیی خواییدایە ،خۆشەویستیش ئازاری زۆرە ،هەر چوار وەرزی ساڵ بۆ مەحوی هەریەکە و هەمووی ئازارکێشانە،کەواتە بەهار و هاوین وپایز و زستان لە چرکەیەکدا بۆ مەحوی کۆ بوونەتەوە وبوونەتە کاتی ئێستای سۆفی ،ئەمەش جۆرێکە لە پێچانەوەی کاتی سۆفی لە چرکەی هەڵقولآنی سۆزی ئەڤینی خوایی:

لە ئیعجازی مەحەببەت چار فەسڵم جوملە بۆ جومعە

سروشکم سوورە،رەنگم زەردە،لێوم وشکە ،چاوم تەڕ /ل١٣١

مەحوی لێرەدا لە خۆشەویستیەکەی فەنا بووە و وەکو خودێکی رەها کۆتی کات سنوور داری نەکردووە و ئەم کۆبوونەوەی چوار وەرزە جۆرە کەرامەتێکە،چونکە خۆی بە (ئیعجازی مەحەببەت) ی داناوە ،کەواتە کارێکی لە رادەبەدەر و جۆرە پەرجۆرێکی عەشقی خواییە.

لە بەیتێکیدیکەشدا هەمان واتای بەیتەکەی سەرەوەی نیشان داوە،مەحوی پێی وایە عاشقی رووسوور ئەو کەسەیە کە لە بەر دەرگای

خۆشەویستی (حەزینە ،دیدە پڕ ئەسرینە ،دڵ خوێنینە ،رووزەردە). ئەمەش هەمان کۆبوونەوەی چوارەرزەکەیە لە کاتێکی دیاریکراودا .

حەزین ←── پایزە ،دیدە پڕ ئەسرینە ←── زستانە،

دڵ خوێنینە ←── بەهارە، رووزەردە ←── هاوینە.

لەبەر قاپی مەحەببەت ئەو خودا پێداوەیە رووسوور

حەزینە،دیدەپڕئەسرینە،دڵ خوێنینە، رووزەردە /ل٢٧٠

ئەمجارە بە پێچەوانەی بەیتەکانی سەرەوە مەحوی بۆکاتی خۆی دەچێت و خۆزگە بە رابووردوو دەخوازێ،چ رابووردوویێ ؟ئەو رابووردووەی کە لە گۆشەی بێکەسیدا بووە و لە مەقامی نەمان (فناء) هەڵس وکەوتی کردووە و بە کاتێکی خۆشی داناوە و واپێدەچێ لە (فناْ فی اللة)دابووبێت ،بۆیە هەرکە لە بێ ئاگاییە وەئاگای بووەتەوە وتێکەڵی دەورو بەرەکەی بۆتەوە،ئەو دەوروبەرەی بەکەس دانەناوە و پێی وایە لە بێ کەسیدایە:

چ خۆش وەقتێ بوو ئەم وەقتەم لە گۆشەی بێکەسیدا بووم

وەکوو هایم لە دەشتی ناکەسیدا ئێستە ئاوارەم /ل٢٢٩

مەحوی لەم بەیتەی رابووردوودا دووجار وشەی بێکەسیی بەکارهێناوە ،لە لایەکەوە هەردووکیان ئاماژەن بە نامۆیی ولە لایەکی دیکەوە دژیەکن ،بێکەسیی یەکەم نەمانە لە خودا و بێکەسی دووەم ژیانە لە دەوروبەر ،ئەو ژیانەش لای شاعیر جۆرە ئاوارەییەکە،چونکە دەوروبەرەکەی لەگەڵ حاڵی مەحوی ناگونجێت و لە حاڵەتی گرژی (قبض)* دایە کە دژی حاڵەتی کرانەوەیە (بسط) **.

* گرژی وکرانەوە دوو پلەی سۆفیانەن و لە دوای ترس و تکا سەر هەڵدەدەن ،گرژی بۆ عاریف لە پلەی ترسە بۆ رێبواری سەرەتا.گرژی گرژ بوونی دڵە و کرانەوە کرانەوەی دڵە لە ژێر حاڵەتی کەشف،فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ،سید جعفر سجادی ،ص٦٣٤.

** حاڵێکی بێ تەکلیفە وهاتن و رۆیشتنی بە هەوڵ وکۆششی نیە وخودا ئەو بەندەیە لە پێش چاوان بە ئاسوودە نیشان دەدا و هەموو شتێ لەگەڵیدا دەگونجێ وئەو لە هیچ شتێ ناگونجێت . فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی،ص١٩٤.

# ئــەنـجام

لێکۆڵەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا گەیشتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١. سۆفی لە خودی خۆیەوە نامۆیە ،چونکە لەگەڵ دەوروبەرەکەی ناگونجێ وچاوی لەو باڵایە گیانییە یە کە شوێنی سەرەتای گیان بووە.
٢. مەحوی خۆی بە تەنیا دەبینێ لە کۆمەڵگادا وتاڵاوی مەرگی لابووەتە شەربەت ، تەنیاییش نامۆییە.
٣. زمانی شیعرەکانی مەحوی نامۆییی پێوەدیارە ،چونکە زمانی سۆفی رەمز ئاسایە وخەڵکی ڕەمەکی تێی ناگەن .
٤. مەحوی لە نامۆییی ناسینی سۆفیانە دا باڵادەستە ،چونکە ناسین جۆرە دابڕانێکە لە دەوروبەر و دابڕانیش هەست بە نامۆیی کردنە .
٥. کات لای سۆفی وەکو کاتی فەلسەفی نییە و تەنیا بریتییەلە کاتی ئێستا، مەحویش وەکو سۆفیەك ئاماژەی بەمە کردووە.

# سەرچاوەکان


## عەرەبیەکان

١. الاغتراب فی تراث صوفیة الاسلام ،ط١،د.عبدالقادر موسی المحمدی،بیت الحكة –بغداد،٢٠٠١.

٢. خصائص التجربة الصوفیة فی الاسلام ،د.نظلة احمد نائل الجبوری،بیت الحكة –بغداد،٢٠٠١.

٣. الرسالة القشریة ،ابوالقاسم القشیری،دارالتربیة للطباعة والنشر والتوزیع،بغداد.

٤. فصوص الحكم ،ط٢،ابن عربی،تحقیق:ابوالعلا العفیفی،مطبعة الدیوانی،بغداد ١٩٨٩.

٥. كتاب العین،ط٢، خلیل بن احمد الفراهیدی ،تحقیق :مهدی المخزومی ود.ابراهیم السامرائی ، الدارالوطنیة،دارالشؤون الثقافیة،بغداد١٩٨٦.

٦. المختار من صحاح اللغة ،ط٤،محمد محی الدین ومحمد عبداللطیف،مطبعة الاستقامة، القاهرة ١٩٣٤.

## کوردییەکان

٧.نامۆیی،چ٢ ،غیاپ الدین النقشبندی ،دەزگای چاپ وبلآوکردنەوەی بەدرخان ،هەولێر ٢٠٠٤.

٨.دیوانی مەحوی ،چ٢ ،مەلا عەبدول کەریمی مودەریس ومحەمەدی مەلا کریم ،چاپخانەی ئۆفێستی حسام،بەغدا ١٩٨٤.

فارسییەکان

٩.فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ،چاپ ٤،د.سید جعفر سجادی،چاپ افست گلشن، تهران ،١٣٧٨.

ئینگلیزیەکان

.١٠

Oxford advanced learner's oxford university press 1980 120 Thimpressind.

نامەی ماجستێر

١١.الغربة و الحنین فی شعر الفتوحات الاسلامیة ،رسالة ماجستیر،حمه رضا حمه امین، کلیةالاداب،جامعة صلاح الدین ،١٩٩٧.

## لە نێوان مەحوی و مەلا مەحەمەدی خاکیدا

مەحوی یەکێکە لە شاعیرەکانی چینی دووەمی قوتابخانەی شیعری بابان و لەدوای (نالی) بەیەکێك لەپێشڕەوەکانی شیعری ئایینی دادەنرێ و گەلێ لە شاعیرانی وەکو (مەلا مەحەمەدی خاکی و سەید ئەحمەدی نەقیب و حەمدی و .....هتد) کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی شیعرە ئاینیەکانی مەحوی بەگشتی و قەسیدەی (بەحری نوور) ەکەی بەتایبەتی ، تەنیا حەمدی نەبێ کە چاولێکەریی ئەو دوو غەزەلەی مەحوی کردۆتەوە کە کۆتاییان بە (شەو[٣]،ڕۆژ[٤]) هاتووە.

ئەم کاریگەریەش لەهەردوو لایەنی روخسار و ناوەڕۆکەوەیە ، لە لایەنی روخسارەوە لەسەر هەمان بەحری عەرووزیی عەرەبی و هەمان سەروای مەحوییان دووبارە کردۆتەوە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەو شاعیرانە بەگشتی پابەندی قەسیدەکەی مەحوی بوونە و مۆسیقاکەی کێشیانی کردووە و ویستبێتیان یان نەیان ویستبێ بەهەمان کێش و سەروا هاتوونەتە مەیدانەوە ، لە ڕووی ناوەڕۆکەوەش بە گشتی لە کۆسەڵی خاڵدا هاوبەشن و جێ پەنجەی قەسیدەکەی مەحوییان پێوەدیارە.

تەوەرەی باسەکەی ئێمە تەنیا مەحوی و مەلا مەحەمەدی خاکییە ، بۆیە بەپێی توانا هەوڵدەدرێ لایەنی لێکچوون لەنێوان قەسیدەکەی خاکی و (بەحری نوور) ەکەی مەحوی دەستنیشان بکرێت .

### لایەنی روخسار :-

ئەگەر بێت و سەیری یەکەم بەیتی هەردوو قەسیدەکەی خاکی و مەحوی بکەین دەبینین کەوا هەردووکیان لەبەحری عەرووزیی هەزەجی هەشتی تەواون و سەرواکانیشیان بە (انە) کۆتایی هاتووە.

**خاكی / ببارێنی خـودا بـارانـی هـەرچی فەیز و ئیحسانە**
**لەسەر ئەو باعیثی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەكوانە** (٥)
**مەحوی / (وصلی الله علی) ئەو بەحـری نـووری عیلم و عیرفانە**
**كـە دەركـی غـەوری ناكـا (غیر علم الله سبحانە)**(٦)

خـاڵێكی تـری لێكـچوونەكە شـیان لەوەدایـە كـەخاكی نـاوی شـیعرەكەی نـاوە (قەسیدەی نوور) وەكو (بەحری نوور) ەكەی مەحوی.

## لایەنی ناوەرۆك :-

هەرچەندە مەحوی بەتەمەن هێنـدە لـەخاكی گـەورەتر نییـەو لەیـەك سـەردەمدا ژیاون ، بەڵام لەبـەر ئـەوەی لای مـەحوی خوێنـدوێتی زۆر ئاسـاییە كەچـاوی بـە (بەحری نـوور)ەكـەی مـەحوی كـەوتبێ و پێـی كاریگـەر بـووبێ ، جگـە لەمـەش بەڵگەیەكی ترمان بەدەستەوەیە كە بەتەواوەتی لایەنی كاریگەریەكە دەسەلمێنێ و ئەوە نیشان دەدا كە خاكی لەخەرمانی شیعری مەحوی سوودی وەرگرتـووە و خەریكی خاكە رۆیە و دان كۆدەكاتەوە ، هەروەك لەم بەیتەی خوارەوە دەڵێت :

**لەجارو خەرمەنی فەضلێ وكەمالی (محوی) یـاخـاكی**
**خـەریكی خاكەرۆیە و گوڵ دەچێنێ و دانە موورانە** (٧)

بەم پێیە دەتوانین دان بەوەدانێین كە (قەسیدەی نوور) ی خاكی لـەژێر سـایەی (بـەحری نـووری)ی مەحویـدا نووسـراوە و هـەردووكیان سـەرەتا بەسـتایـشی پێغەمبـەر (د.خ) دەسـت پێدەكـەن و دوایـی باسـی ئـەو رووداوانـە دەكـەن كـە لەشەوی لـەدایكبوونی پێغەمبـەردا (د.خ) روویـان داوە ، دوای ئەمـە دێنـە سـەر هەندێ لەپەڕ چووەكانی پێغەمبەر (د.خ) ئینجا هەردووكیان ئامـاژە بەوەدەكـەن كە شیعرەكانیان دیارییـەكی كەمـە و شـایانی ئـەوە نـی یـە پێـشكەش بكرێـت ،

لەدواییدا دێنە سەر ستایشکردنی خەلیفەکانی راشدین و لەئەنجامدا بەپاڕانەوە لەخوا کۆتایی بەقەسیدەکانیان دێنن .

نکوولّی لەوە ناکرێ کە خاکی کاریگەریی مەحوی بەسەرەوەیە و زۆر خاکسارانە خۆی ئەمەی نیشانداوە ، بەلاّم نابێ ئەمەش لەیاد بکرێ کەخاوەنی دەنگ و رەنگی خۆیەتی و لەداڕشتنەکانیدا زۆر بەتوانایە و لەزۆر شوێندا هاوشانی مەحوییە و بەکورتی زۆر وەستایانە کارەکەی ئەنجام داوە و لەمەحوی پشوو درێژتر بووە و قەسیدەکەی (١٦٨) بەیتە ، کەچی قەسیدەکەی مەحوی (١٢٤) بەیتە.

ئێمە لەم بەرامبەریەدا نامانەوێ بەدرێژی بچینە ناو بابەتەکەوە و تەنیا ئەو خالّە سەرەکیانە دەستنیشان دەکەین کە لەهەردوو قەسیدەکەدا بەزەقی دەکەونە بەرچاو و لێکچوون ، وردەلێکچوونەکانی تر بۆ خوێنەر بەجێ دێلّین.

ئێستا وا لەخوارەوە بەپێی زنجیرەی بەیتەکانی خاکی و لێکچوونی سەربابەتەکان بەیتەکان تۆمار دەکەین و ئاماژە بەلێکچونەکان دەکەین :

**١) خاکی و مەحوی بەستایشکردنی پێغەمبەر (د.خ) دەست پێدەکەن :**

**خاکی / ببارێنێ خـودا بـارانی هـەرچی فەیز و ئیحسانە**
**لەسەر ئەو باعیثی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە [(٨)]**

**مەحوی / (وصلی الله علی) ئـەو بەحـری نووری عیلم و عیرفانە**
**کـە دەرکـی غـەوری نـاکـا (غیر علم الله سبحانە)[(٩)]**

هەردووکیان لەشکۆمەندیی پلە و پایەی پێغەمبەر (د.خ) دەدوێن و داوای باراندنی فەیز و رەحمەتی خوا دەکەن لەسەر ئەو دەریای نوور و هەلّبژاردەی جیهانە . جیاوازییان لەوەدایە کە خاکی دەیکاتە هۆی پەیدابوونی گەردوون : واتا بەرەو راستی مەحەمەدی دەچێت (الحقیقە المحمدیە) ، کەچی مەحوی دەیکاتە خاوەنی زانستی خوایی (العلم اللدنی).

٢) کەمبوونی نرخی پەرچووی دەستی سپی (الید البیضاء) :

خاکی / (یـــەدی بەیزا) ی لەباخەڵ نیٚ نەماشەو ، شەم چیەکە مـــڕۆ
ظهووری نـــەیری جـــەبهەی رەئیسی ئـــەنبیایـــانـــــــــە [١٠]

مەحوی / (یـــەدی بەیضا) چیە ، هەر تاقە ئەنگوشتێکی چـــەند ئیعجا
زی لیٚ ظاهیربـــووە ، هـــەریەك وەکو ماهیٚ کـــــــە تابانە [١١]

هەردووکیان باسی پەرچووەکەی حەزرەتی مووسا دەکەن و وایان نیشانداوە کە ئەو پەرچووە (معجزە) لەبەر پەرچووە زۆر و بەهێزەکانی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) باوی نەماوە و خۆری رووناکی جیهانی رۆشن کردووە و تاکە پەنجەیەکی چەندەها پەرچووی نواندووە کە وەکو مانگی چواردە وان.

٣) بینینی خوا لەنێوان حەزرەتی مووسا و محەمەد دا (د.خ) :

خاکی / (أرنی) و (لن ترانی) با نەلێت و نـــەشنەویٚ مووسا
بەسائیل نادریٚ ئـــاخر ئەوی دەرخواردی میوانە [١٢]

مەحوی / کەلیم (أرنی) کە فەرمـــوو هـــەر جوابی (لن ترانی) ی دی
موشەرەف بوو محەمەد بیٚ طە لەب بەوەرتەبە و شانـــە [١٣]

خاکی و مەحوی باسی بینینی خوا بەچاوی سەر دەکەن لەنێوان حەزرەتی مووسا کە داوای ئەو بینینەی کرد و بە (نا) وەڵامی درایەوە ، کەچی محەمەد (د.خ) بیٚ ئەوەی داوا بکات خوای مەزن بانگی لای خۆی کرد و بەو پایەیەگەیشت .

خاکی و مەحوی لەوباوەڕەن کە محەمەد (د.خ) بەچاوی سەری خوای بینیوە ، چونکە میعراج خۆی پەرچووە و ئەنجامی پەرچوو ئامێزی لیٚ پەیدا دەبیٚ ، بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن بەچاوی دڵ (شهود) خوای بینیوە بۆچوونەکەیان کزە ، چونکە شهود بۆ هەموو (وەلی و پیاو چاکێك) دەشێت . لەبەیتەکاندا (أرنی ، لن ترانی ، مووسا ، محەمەد) دووبارە بۆتەوە.

٤) بێ توانایی (قیس و سحبان) لە ستایشکردنی پێغەمبەردا (د.خ) :

خاکی / لــــە وەصفی پـــــاکـــــی ئـــــەو ذاتە زوبان لاڵە وەکو لالە

ج جێگەی (قیس) و (سحبان) ە سەناخوانی کە سوبحانە[١٤]

مەحوی / بـــەیـــانی گـــەورەیی خولقی کەسێ ئایەت لە شەئنی بێ

نە مەقدووری من و تۆیە ، نەتیشی (قیس) و (سحبان) ە [١٥]

خاکی بەتەواوی واتای بەیتەکەی مەحوی دووبارە کردۆتەوە و هەردوو لەو باوەڕەن کەخۆیان و قیس و سەحبان ناتوانن بەجوانی ستایشی پێغەمبەر (د.خ) بکەن وەك ئەو ستایشەی کە خوای مەزن لە قورئاندا فەرموویەتی ((وأنك لعلى خلق عظيم)) [١٦] ، جگە لەواتای ئەو ووشانەش هاوبەشن (قیس ، سەحبان ، شاعیر ، خوا).

٥) لەبارەی نازرەواییی (شفاعە) پێغەمبەرەوە (د.خ) :

خاکی / مـــوحـــەمەد یەعنی سەروی جۆیباری راست کرداری

بەیاری بــــــــاری دێ بـــۆ رستگاری ئەم زەعیفانە[١٧]

مەحوی / شـــەفیعی رۆژی رەستا خێزە ، بـــۆ هـــەموانە دەستاوێز

ئـــەوە ئـــەو رۆژە وەك خۆ ، (ما بقى صماً و عميانه) [١٨]

هەردووکیان لەسەر نازرەواییکردنی پێغەمبەری ئێمە کۆکن ، جیاوازییان لەوەیە کە مەحوی پێی وایە هەر ئەو بێ ئیزندان توانای نازرەواییکردنی هەیە و ئەوانی تر کەم دەسەڵاتن ، نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە پێغەمبەران و زانایان و شەهیدەکان توانای نازرەواییکردنیان هەیە بەتوانای خوا .

٦) قەبووڵکردنی قەسیدە کوردیەکان :

خاکی / ئەبێ (خاکی) ئەتۆ خۆت چی و دیـــــاریـــی تـــۆ ئـــەبێ چـــی بێ ؟

لـــەبۆشاهی عـــەرەب هەرگیز نـــەلێی ئـــەم شیعرە کـــــوردانە

مەگەر شاهی و روسول ، هادیی سوبول ، سەرخێلی جوملە و کول

بـــــــەئیحسانی بکـــاتە حسێن بڵێ وەك شیعری حــــەســانــە [19]

مەحوی / موکەرەڕ بوو قـــەسیدەی بوردە نەشئەی عالەمی پـــــڕ کرد

بفەرموو بـــــەم قـــــەسیدە کوردە نۆبەی نەشئە پێوانە

ئـەگەر بوردە ، ئەگەر کوردە ، ئەگەر صافە ، ئەگەر دوردە

قـــوبووڵی تـــۆ کـــەبوو لەبڕێزی نەشئەی ڕەوح و ڕەیحانە [20]

هــەردوویان لــە پێغەمبــەر (د.خ) دەپاڕێنــەوە کـە قەسـیدە کوردییــەکانیان لێ وەرگرێ ، چونکە لەو سەردەمەدا وا باو بووە کە ستایشی پێغەمبەر هـەر دەبـێ بە عەرەبی و فارسی بێ ، بەڵام خاکی و مـەحوی ئـەم سنوورەیان بەزاندووە و (لەپێش ئەمانیشەوە –نالی–) زمانی کوردیان هێناوەتە ریزی زمـانی عـەرەبی و فارسی و ستایشی پێغەمبەریان (د.خ) پێ نووسیوە ، مەحوی بە ئاشـکرا زمـانی کوردی لەپلەی دووەم داناوە بەرامبەر زمانی عەرەبی ، چونکە (بوردە و کوردە) لەگـەڵ (صـافە و دوردە) پێچە و پەخـشی ڕێکـن و بـەم پێیـە کـوردە بەرامبـەر دوردەیە کە خڵت و لێڵی دەگەیەنێ.

٧) داواکردن لەپێغەمبەر (د.خ) بۆ قەبووڵکردنی دیارییە کەمەکانیان :

خاکی / گەدا دیاری ئەبا بـۆشاو لێکێن کەم بەفکری زۆر

قووبوڵ فەرموو کەریمانە لەمن دیاری فەقیرانە [21]

مەحوی / قووبوڵی کەم لـــەکەمکردن ، وەها واتێبگا زۆرە

بـــەتۆ زۆری بزانم ، کەمتری شیمەی کەریمانە [22]

هەرچەندە دیاریەکانیان کەمە ، بەڵام لای خۆیان زۆرە و بەئومێدی ئەوەن کە بە زۆر لێیان وەربگیرێ ، چونکە پێغەمبەر (د.خ) خۆی بەخشندەیە و دیاری کەم بە زۆر حسێب دەکا ، سەرەڕای واتاکانیان ئەم ووشانەش دووبارەن (کەم ، زۆر ، قوبووڵ ، کەریمان ، گەدا ، شا).

**٨) چوونە میعراجی پێغەمبەر و (د.خ) گەڕانەوەی بەخێرایی :**

**خاکی / طەی و پەی کرد رەهو پەردە ، سوئالی کرد جـەوابی گرت**

**عـــــەجەب بازانە بازانە چووهات و باز هەر ئەو ئانە[٢٣]**

**مەحوی / لەظەرفی یـەك نەفەسدا شەو هەزار ئەندەر هـــەزاران ساڵ**

**زیــــــاتر بەڵکی رێی طەی کات و ریجعەت کا هەر ئەوئانە[٢٤]**

هەردووکیان ئەوە روون دەکەنـەوە کـە میعراجەکـەی هێنـدەی پـێ نەچـووە زوو گەڕایـەوە شـوێنی خـۆی ، جگـە لـە دووبـارە کردنـەوەی هـەمان مەبەسـت ئـەم ووشانەش لێکچوون (طەی ، رێ ، هاتنەوە ، ئانە)

**٩) بێ سێبەری پێغەمبەر (د.خ) :**

**خاکی / جیهـــان ســـایــە نیشناتۆ مـــەگـــەر رۆحی نییە سایەت**

**بەڵێ سایە وەظیفەی جیسمە ، جیسمی تۆ هەمووی جانە[٢٥]**

**مەحوی / لەگەڵ بێ سایەیی ، سایەی خەیاڵی کەوتە سەر هەر کـــەس**

**چ کــەسدار و چ بێکەس ، ســـەییدە ، سەرداره ، سوڵتانە[٢٦]**

مەحوی و خاکی لەو باوەڕەن کە پێغەمبەر (د.خ) بێ سێبەر بووە ، چونکە لەش سێبەری هەیە و ئەو گیانە ، دوورنیە ئەمە بۆچوونێکی سۆفیانە بێت ، پێغەمبـەر (د.خ) وەکو هەموو کەسێکی تر مرۆڤ بووە ((قل انمـا انـا بـشر مـثلکم یـوحی الی انمـا الهکـم الـة واحـد))[٢٧] ، لـە کتێبـەکانی سـیرە ئامـاژە بەمـە ناکـەن ، تـەنیا فەرموودەیـەکی (ابـن عـەباس) هەیـە کـە دەڵـێ ((لم یکـن لرسـول الله(ص) ظـل ................))[٢٨].

**١٠) شەقبوونی تاقی کیسرا و کوژاندنەوەی ئاگری زەردەشت و رۆچوونی ئاوی ساوا شەوی لە دایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) :**

**خاکی / نـــەهــەر کەسری بەکیسرادا و وقەسری قەیسەری لـــەقکرد**

مـــەهی شــــەقکرد و داغـــداری شەهە جــەبهەی غولامانە[29]

هــــەڵی گــرت ئـــاوی ســـاوا و بــەناری زەرد هێشتیاپشت

ئەو ئیحیای عەینی ئیعجازە و ، ئەم ئیطفای ناری طوغیانە[30]

مەحوی / رشێنەی ، ئاگری بــەردایە عــومـــری ئاگری زەردەشت

بەبەرقی بوو کە شەقبوو تاقی کیسرا ، بوو بەوێرانە[31]

دڵی سووتــانە بەزەردەشت و بەکەسری کیسرەوی . گریا

ئەوەندە بــەحـــری (ســـاوا) نــم لـــەچاویدا بووە تانە[32]

خاکی لەو باوەڕەدایە کە ئەو شەوە ئاوی ساوا ئاگری زەردەشتی کوژاندۆتەوە ، بۆچوونەکەی خاکی سادەیە و لەخەبەردانێکی ئاسایی دەچێت ، بـەڵام مـەحوی شـاعیرانەتر بەیتەکـەی دارشـتووە و وێنەکـەی کێشاوە و لای وایـە ئـاوی سـاوا هێندە بۆ شـەقبوونی تـاقی کیـسرا و کوژانـەوەی ئـاگری زەردەشـت گریـاوە تـا تەڕایی لەچاویدا نەماوە و سۆمایی داهاتووە.

١١) پەرچووی (معجزە) ئاو لەپەنجە هاتنی پێغەمبەر (د.خ) :

خاکی / کــەفافی شوربی خۆیان و دەواب و غەسل و دەست نوێژیان

لەبەینی پەنجەی ئاو سەرکەوت و ئەدووت عەینی ریضوانە[33]

مەحوی / سەری کــرد ئاو ئەوەندە ، لـــەشکرێکی سێ صەدیی دا ئاو

لـــەگــەڵ ئــاوی وضـــــوو ، بەخوا ئەو ئاوە ئابڕوومانە[34]

هەردووکیان باسی ئەو پەرچووەی دەکەن کە لەیەکێ لە غـەزاکان موسـڵمانەکان (٣٠٠) کەس بوونە و ئاویان بەپێی پێویست لانـەماوە و ئـیتر نێـوان دووپـەنجـەی پێغەمبەر (د.خ) بووەتە کانی و کاروباری خۆیان پێ جێبەجێکردووە.

١٢) پەرچووی کڕنۆش بردنی دار بۆ پێغەمبەر (د.خ) :

خاکی / خــۆ سجدەی دار و سجدەی بەردی زۆرە میسلی دار و بەرد

نــەدارو بــەردی تــۆ ، بــاوەڕ بکە ئــەم دار و بــەردانە[٣٥]

مەحوی / بە ئەمری یا ئیشارەی بەس درەختی ریشە دابــەستوو

لە رەگ دەربێت و بێتە خــزمەتی رەقصانە رەقصانە[٣٦]

ئەوەی ڕاستی بێ مەحوی لەقەسیدەکەیدا باسی سێزدە پەرچووی کردووە و هێشتاش ئاماژە بەوە دەکا کە هیچی باس نەکردووە ، خاکیش بەگشتی باسی ئەمانەی کردووە و ئێمەش لەم دووانە زێتر تۆمار ناکەین . خاکی و مەحوی لەو باوەڕەن کە پەرچووەکانی پێغەمبەر (د.خ) لەژمارە نایەت ، بۆ نمونە :

خاکی / حەدم کوا من بەیان و عەدی ئیعجازی (محمد) کەم

کە تەعدادی نجوومی ئــــاسمان خاریج لە ئیمکانە[٣٧]

مەحوی / ئەگەر بێ موعجیزاتی صەد یەکێکی بێنمە تــەحریر

دەبــێ هــەر تــاقــە بەیتێکم ببێتە صەد کوتوبخانە[٣٨]

١٣) ستایشکردنی خەلیفەکانی راشدین (ر.خ) :

خاکی / خصوص ئەو صیدیق کردارە ، دەروون گەنجینەی ئەسرارە

کە (ثانی اثنین فی الغارة) ، کە (شیخ الصحب) ی هەمووانە[٣٩]

بــە ئــانــی و ئــەوەلــــەفەرقی ئەبووبەکر و عومەر ئاری

دیــن ئینسانــە لـــەچــاویــا ، ئــەم دووئینسانە ئینسانە[٤٠]

بــرا ئیتر بــەچــۆکــابێ لــەسەر ئەژنۆی ئەدەب دانیش

تــەواو چــاو ببڕە بەرپێی خۆت کە ئیکەبەحسی عوسمانە[٤١]

بلێ تــارێوی طــە بعانی نیفاق ئــەنــدێشی ئــەم صەحرا

کــەنــــارە گیربن ئیتر نــۆبەتۆبەی شێری مــەیــدانــە[٤٢]

**مەحوی / خـــودا ئـــەم ئاینەی لائیق بە بـــــــووبکر و عــومەر دیـــوە**

**کـــە ئـــــەوەل ثانی بوو ، ثانی شەرەفیابـــــــە بە (لوکان).[٤٣]**

**لەبەعدی ئەو دووە عوثمانی (ذی النورین) ە (ذو الانوار)**

**عـــەلـــــی شاهی ویلایەت ، بابی عیلم و شێری یەزدانە[٤٤]**

هـەردووکیان ستایـشی حـەزرەتی ئـەبوبکر و عومـەر و عوسمـان و عـەلی (ر.خ) دەکەن ، خاکی زۆر بەدوور و درێژی ستایشیان دەکا و گـەورەیان نیـشان دەدات ، بەڵام مەحوی تەنیا بە دووبەیت ستایشی هەرچواریان دەکا و زۆر بەچـڕوپڕی مەزنییان دەردەخا ، بۆیە لێرەدا داڕشتنەکەی مەحوی کورتر و ڕەوانێژیانە تر.

**١٤) پاڕانەوە لە خوا لەکۆتایی قەسیدەکانیان :**

**خاکی**

**مــــەڕێـــژە ئـــابــــڕووم یارەب بەئابی رووی بەنی زەهرا**

**من ئەرچی ئابڕووی خۆم ڕشت لەبۆ یەك نان و دوونانە[٤٤]**

**ئیلاهی نیم ئەگەرچی من حەریفی شیعر و ئـەهلی بەیت**

**بـە بەیتم لێ قبووڵ فەرموو ، لەبەر ئەم ئـەهل و بەیتانە[٤٥]**

**مەحوی**

**وەکو (جامی) دەڵێ ، دەم ووشك هەڵاتوو من سەگێکی کەڕ**

**جگـــەر تێنووم و دەخـــوازم نمێ لـــــەو بەحری ئیحسانە[٤٦]**

**دەکەم عەرضی نیاز ، ئەرچی لەتۆ نـــایـــابــــە مـەخفی ڕاز**

**بـــەجـــان و دڵ ، دڵ و جـــــانم ، خودا خواهانە ، خـــواهانە[٤٧]**

هەردووکیان بەکۆمەڵە بەیتێ لەخوا دەپاڕێنەوە کە ئەم چەند بەیتە شیعرەیان لێ قبوڵ بکا و بکەونە بەر نازرەوایی (شفاعە) پێغەمبەرەوە (د.خ) لەڕۆژی دوامایبدا.

# پەراوێزەکان :-

١) ناوی مەلا مەحەمەدی کوڕی مەلا عوسمانی باڵخییە و لەنێوان ساڵانی (١٨٣٠ – ١٨٣٦) لە سلێمانی لەدایك بووە ، لای باوکی خوێندویێتی و لەبەغدا لای موفتی زەهاوی ئیجازەی وەرگرتووە ، لە (١٩٠٦) لە سلێمانی مردووە و لەخانەقاکەی نێژراوە ، دیوانی مەحوی ، چ٢ ، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ، چاپخانەی ئۆفسێتی حیسام ، بەغدا (١٩٨٤ ، ل ٥–٧).

٢) ناوی مەلا محەمەد کوڕی ئەحمەدە و لە (١٨٣٩) لەگوندی (ئەحمەد برندە) لەشارەزوور لەدایك بووە ، هاتۆتە سلێمانی و لەلای (مەحوی) خوێندویێتی و لەسنە خوێندنی تەواو کردووە و بۆ سلێمانی گەڕوەتەوە ، لە (١٩٠٨) کۆچی دوایی کردووە . مەلا محەمەدی خاکی ، شێخ مەحەمەدی خاڵ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا (١٩٧٨ ، ل٩).

٣) دیوانی

٤) مەحوی (ل٢٥٧).

٥) سەرچاوەی پێشوو (ل١٣٨).

٦) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل١٤).

٧) دیوانی مەحوی (ل٤١٩).

٨) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٦٣).

٩) سەرچاوەی پێشوو (ل١٤).

١٠) دیوانی مەحوی (ل٤١٩).

١١) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل١٨).

١٢) دیوانی مەحوی (ل٤٤١).

١٣) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل١٩).

١٤) دیوانی مەحوی (ل٤٣٤).

١٥) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٣١).

١٦) دیوانی مەحوی (ل٤٢٢).

١٧) القلم /٤ .

١٨) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٣٠).

١٩) دیوانی مەحوی (ل٤٢٧).

٢٠) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٣٤).

٢١) دیوانی مەحوی (ل٤٥٤).

٢٢) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٣٤).
٢٣) دیوانی مەحوی (ل٤٥٦).
٢٤) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٠).
٢٥) دیوانی مەحوی (ل٤٣٥).
٢٦) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٢).
٢٧) دیوانی مەحوی (ل٤٣٢).
٢٨) الكهف / ١١٠ .
٢٩) شرح العلامه الباجوري على متن الشمائل المحمديه للترمزي ، ط١ ، مصر ١٣٤٤هـ ، ص٨٥.
٣٠) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٤).
٣١) سەرچاوەی پێشوو (ل٤٦).
٣٢) دیوانی مەحوی (ل٤٢٤).
٣٣) سەرچاوەی پێشوو (ل٤٢٥).
٣٤) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٥).
٣٥) دیوانی مەحوی (ل٤٤٢).
٣٦) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٥).
٣٧) دیوانی مەحوی (ل٤٤٧).
٣٨) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٦).
٣٩) دیوانی مەحوی (ل٤٥١).
٤٠) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٤٩).
٤١) سەرچاوەی پێشوو (ل٥١).
٤٢) سەرچاوەی پێشوو (ل٥٤).
٤٣) سەرچاوەی پێشوو (ل٥٧).
٤٤) دیوانی مەحوی (ل٤٣٩).
٤٥) مەلا مەحەمەدی خاکی (ل٦٠).
٤٦) سەرچاوەی پێشوو (ل٦١).
٤٧) دیوانی مەحوی (ل٤٥٧).
٤٨) سەرچاوەی پێشوو (ل٤٥٨).

# لە نێوان دوو غەزەلی
# شەو و رۆژی حەمدی و مەحویدا لێکۆڵینەوە و بەرامبەری

## بـــــەنـــــاوی خـــــوای دلـــــۆڤـــــان

## پێشەکی

مەحوی [1] یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی کە ڕۆڵێکی دیاری لەسـەردەمی خۆیـدا بووە و شیعرەکانی بەگشتی رەنگدانەوەی واقیعی ئـەو کاتـەی شـاری سـلێمانی بووە و بە پێشرەوی شیعری سۆفیانە و تارادەیەکیش شیعری ئایینی دادەنرێ . کە دەلێن تا ڕادەیەك چونکە (نالی) سـەر مەشقی ئـەم جۆرە شـیعرە بـووە و لەدوای ئەو بە دڵسۆزییەوە مەحوی دروشمەکەی هەلگرتووە و شاعیران چاویان لێی کردۆتەوە.

بـە بۆچـونی نووسـەری ئـەم لێکۆڵینەوەیـە، حەمـدیی[2] سـاحێبقران (١٨٧٨ – ١٩٣٦) یەکێکـە لـەو شـاعیرە بەتوانایانـەی کـە تاڕادەیـەك کاریگـەریی مـەحویی پێوەدیارە لە شیعری ئاینیدا ، ئەم کاریگەرییەش زیاتر لـەدوو غـەزەلی (شـەو و رۆژ) ی مەحوییـەوە سـەرهەڵدەدا ، چـونکە ئاسـۆیەکی گیـانی و فەلـسەفییان پێوەدیارە.

لێکۆلینەوەکە لە دوولایەنەوە خۆی دەبینێ :–

١. لێکدانـەوەی واتـای (شـەو و رۆژ) بـەپێی فەرهـەنگی سـۆفیانە و لێکدانەوەیەکی سۆفیانە بۆ هەردوو غەزەلەکەی مەحوی کە کۆتاییان بە (شەو ، رۆژ) هاتووە.

٢. بەرامبەریکردنی هەردوو غەزەلی (شەو و رۆژ) ی مەحوی و حەمدی ،
ئەمەش لە دوو ڕووەوە ئەنجام دەدرێت :-
أ - لێکچوونیان لەڕووی روخسارەوە.
ب - لێکچوونیان لەڕووی ناوەرۆکەوە.

بەهیوای ئەوەی خزمەتێکی بچووك پێشکەشی ئەدەبی نەتەوایەتیمان کرابێ و مەلۆیەك خرابێتە سەر خەرمانی ئەدەبی کوردی.

# بەشی یەکەم

## ڕۆژ :

بەدواداهاتنی نوور پێی دەگوترێ رۆژ ، هەروەها ڕۆژی پەیمان و ئەلەست و ئەزەلیشی پێ دەگوترێ . بەلای هەندێ لە سۆفیەکان رۆژ پێنج جۆری هەیە :–

١. رۆژی ونبوو (مفقود) : رۆژی جیهانە کە دەڕوا و لەدوای خۆی پەشیمانی بەجێ دێلێ.

٢. رۆژی ئامادەبوو (مشهود) : ئەو رۆژەیە کە تێیدای ، ئەگەر کاری چاکی تێدابکرێ و بەهەل وەربگیرێ بەغەنیمەت لەقەلەم دەدرێ.

٣. رۆژی داهاتوو (مورود) : رۆژی بەیانیەو نابێ دڵی خۆتی تێدا بەند بکەیت و کاتی خۆت بەئومێدی ئەو لەکیس بدەی ، چونکە سبەینێ هێشتا نەهاتووە و لەدەست نی یە .

٤. ڕۆژی بەڵێندراو (موعود) : بەو ڕۆژە دەگوترێ کە تەمەن بەرەو کۆتایی دەچێ و گیان دەگاتە قورگ و ئاوی کەسەر لەچاو دەوەستێ و ڕوخسار زەرد هەڵدەگەرێ.

٥. ڕۆژی درێژکراو (ممدود) : ڕۆژی بەپابوونەوەیە کە هەموو مرۆڤی تێدا کۆدەکرێتەوە و دەکرێنە دوو چین ، پاك و ناپاك[٣].

## شەو :

هاتنی شەو لەفەرهەنگی شاعیران هێمای خەم و ترس و تەنیایی و نامۆیی و مردنە ، ڕۆیشتنیشی ژیان و هیوا و بەختارییە[٤].

لای عاریفەکانیش جارێ جیهانی غەیبە و جارێ جیهانی جەبەڕووتە (سنوری نێوان جیهانی هەستی و ناهەستی) ، هەروەها بە بنەچەی شتەکان و شەوی مرۆڤی دەگوترێ ، تاریکی شەو تاریکی لەگینەکانە (ممکنات) چونکە لەگینەکان

سێبەرن و دەرکەوتەی زۆری حەقن ، مەبەست لەشەوی ڕووناک خودی خوایە ، چونکە خوا بێڕەنگە و بەشەو چوێنراوە[٥].

دوای ئەوەی هەندی لەواتاکانی ڕۆژ و شەومان بۆ ئاشکرابوو ، ئێستا دێین لەژێر سایەی ئەم بۆچوونانە هەردوو غەزەلەکەی مەحوی کە لەبارەی (شەو و ڕۆژ)ە شی دەکەینەوە.

شاعیرانی کۆن بەگشتی یارەکانیان بە ڕۆژ چوواندووە چونکە هیچ شتێ خۆی لەبەر تیشکی ئاگریێ و بەزێنەری هەموو جوانێکە لەجیهانی هەستیدا.

بەڵام لەبەر ئەوەی مەحوی بەگشتی شیعرەکانی لەتەوەری شیعری سۆفیانە دەخولێنەوە بۆیە سروشتی ڕۆژیش گۆڕاوە و لەدولبەرەوە کاڵای دڵداری بەبەردا براوە و بەدوای دولبەری مانگ ئاسادا وێڵە.

لەم غەزەلەی مەحویدا ڕۆژ دڵدارە و شێتی ڕووی یارەکە پێغەمبەری ئیسلامە (د.خ):

**ڕووتی دی ، لەو ڕۆژەوە ، گەرِ ڕۆژە سەرگەردانە ڕۆژ**
**گـــــەییە ئێوارە ، وەکو من ، ئیشی قوڕ پێوانە ڕۆژ[٦]**

واتا : لەو ڕۆژەی کە خوا نووری محەمەدی (د.خ) ئەفراند ، لەو نوورە بوونەوەری داهێنا (ڕۆژیش یەکێکە لەوان) ، بۆیە ڕۆژ حەز دەکا بەرەو کانگای خۆی بچێتەوە کە نووری محەمەدە و هەر لەو ڕۆژەوە بەدوایدا دەگەڕێت .

کە ڕۆژ عاشق بێ ، دەبێ لەپێناو عەشقەکەیدا سەر دابنێ چونکە ئەوەی بەگەڵ کاروانی ئەوین کەوت ئەمە پیشەیەتی :

**ڕەهرەوی ڕێگەی مـــەحەببەت وادەبێ ، هەر سەعیەتی**
**تــا هــەیــە لــەم ڕێگە ئـــاخر کاری سەردانانە ڕۆژ[٧]**

هەرچەندە لەجیهانی هەستیدا مانگ بەرامبەر ڕۆژ خۆی ناگرێ و تیشکی دەشاردرێتەوە ، کەچی لەم هەڵوێستەدا کار ئاوەژۆیە و ڕۆژ کە عاشقە و پەروانە ئاسا لەدەوری مۆمی ئەو مانگە دێت و دەچێ و چاو لەپەروانە دەکا و دەیکاتە مامۆستای خۆی لەسووتاندا هەروەك سەعدی شیرازی دەڵێت :

**ای مـرغ سحر عشق ز پروانه بیاموز**

**کان سوختەرا جان شد و آواز نیامد[٨]**

بەم جۆرە مەحوی ئەم واقیعە پێچەوانەیە دەگونجێنێ بەکاریگەری ئەو عەشقەی کە نەشیاوە دەشێنێ:

**لاجەرەم کردوویە نووری جیلوەی ئەو ماهە بە چاو**

**دەوری بۆ ئەو شەمعەیە دایم وەکـو پەرەوانە ڕۆژ[٩]**

ئەوەی مەحوی ڕۆژی بە عاشق داناوە و ڕوونی کردۆتەوە کە لەپێناو ئەو عەشقەدا داوێنی هەڵکردووە و لەتەواف دایە ، ئینجا داوا دەکا هەرکەسێ کە دەیەوێ بگاتە یار دەبێ ڕۆژ ئاسابێ و ئارامگرتن نەزانێ ، کەواتە عەشقەکە دابەزییە سەر زەوی و مرۆڤ بەدوای نووری محەمەدیدا (د.خ) وێڵە :

**مەطلە بت گەریارە ، هەر سەعیت بەکارە دائیما**

**بۆ طە وافی قاپییەك وا بەرزەدە دامانە ڕۆژ[١٠]**

دووبارە شاعیر بەرەو عەشقی ڕۆژ دەچێتەوە و ڕوونی کردۆتەوە دەبێ بەشەو پێکی لە دەستی مەیگێڕ (خوا) وەرگرتبێ بۆیە وابەمەستی لەبەیاندا سەر دەدرێنێ و کەوتۆتە مەقامی نەمانەوە (فنا) :

**شەو دەبێ بادەی لەدەستی ساقیەك وەرگرتبێ**

**ئەم سبەینێیە لەمەشریق دێتەدەر مەستانە ڕۆژ[١١]**

ئەمجارە دولبەر لەشێوەی لەیلادایە ، ئەمەش پیشەی گەلێك لە عاریفەكانە كە خوا یان پێغەمبەر (د.خ) لەشێوەی ئافرەتێ بەدی دەكەن ، چونكە ڕەگەزی (مێ) لای یۆنانی و میسری و جاهیلی و مەسیحیەكان پیرۆز بووە ، بۆیە رۆژ كەوتۆتە شاخان و بەدوای یاردا دەگەڕێ ، واتا :
هەڵاتن و ئاوابوونی لەودیو شاخەكان لای شاعیر جۆرە گەڕانێكە بەدوای جوانی یاردا:

**ئــەڵبەتــە مــەجنوونی رۆژی رووەــەتی لــەیلایەكە**
**موتتەصیل ، شام و سەحەر ، كەوتۆتە ئەم شاخانە رۆژ[١٢]**

ئەو عەشقەی مەحوی لەم غەزەلەدا دەستنیشانی كردووە بەردەوام لەجێگۆركێ دایە لەنێوان رۆژ و مرۆڤ ، لەم بەیتەی خوارەوەدا شاعیر خۆی دڵدارە و لەبەر جوانی یار ڕۆژی لەبەر چاو كەوتووە ، دوور نییە مەبەستی لەو مانگە نووری پێغەمبەر (د.خ) بێ ، بۆیە لەبەر رووناكی ئەو پێویستی بە ڕووناكی ڕۆژ نییە ، چونكە رۆژیش لەوەوە ڕۆشنی بۆ هاتووە :

**ماهەكەم ئەمشەو شوكــر پرتەوفشانی خــانەیە**
**قەت لەدەرگا دەردەچم گەربێتە ئەم سەربانە ڕۆژ[١٣]**

رۆژ لەئەوینەكەیدا بێ ئارامە و تارۆژی بەپابوون كەس چارەی ناكا گەر مەسیحیش بێ ، چونكە دەرمانی دڵدار گەیشتنە دولبەرە و ئەمەشی بۆ نەرەخساوە :

**ئەم گلاراوەی لــەعیشقە تــا قیامەت هــەردەبێ**
**صەد مەسیحا چاری ناكا ، دەردی بێ دەرمانە ڕۆژ[١٤]**

رۆژ بەشەو و رۆژ وێڵی بینینی ئەو یارەیە ، بەڵام بەو هەموو تیشکەوە پەی پێ نەبرد و بەجیلوەی نووری شاد نەبوو ، چونکە ئەو نوورە لەنووری خواوەیە و شەو و رۆژی ئاساییش دەمی بینینی ئەو نوورە نییە :

**رۆژ و شەو ئەم سەر زەمین و بن زەمینەی پشکنی**
**نەبووە شوێن هەڵگر لەعەکسی جیلوەی ئەو جانانە ڕۆژ(١٥)**

لەسەرەتاوە تا ئێرە عاشق دیارە کە رۆژە و وەکو گۆیە لەمەیدان و عەشقیش گۆچانەکەیە ، بەڵام هێشتا گۆچان بازەکە بەتەواوی دیار نیە :

**ڕۆحی بەفیداکە بزانە کێیە چەوگان بازەکە**
**((مەحویا)) چەوگانە عیشق و ، گۆیە لەم مەیدانە رۆژ(١٦)**

لێرە بەولاوە دولبەر بەدیار دەکەوێ و ئاشکرایە کە مەبەستی پێغەمبەر (د.خ) ، چونکە (رۆژ) ی عاشق بێ هێزە لەوەی نەیتوانی بەڕووناکی خۆیەوە بگاتە خزمەت دولبەر و بەڵکو شەو ئەو مەزنییەی بەنسیب بوو و یار (محەمەد) بەشە و بەرەو ئاسمان رۆیشت :

**حەقیە رۆژ و شەو کە بێ تابی دەکا ، وادەی ویصال**
**ئەو بوو ، بێبەش ما لە وەصڵی ئەو سەراپا جانە رۆژ(١٧)**

کەواتە لەم بەیتەوە رۆژ بەرە و نائومێدی دەچێ و شەو جێگای دەگرێتەوە لەعەشقەکەدا ، چونکە لەداوێنی ئەو شەوەدا بەرەبەیانی هیوای ساڵی لێ دەپشکوێ و هەزاران رۆژ خۆیان پەنهان داوە :

**شەو چ شەو ، لێ پشکواوی قەرنەها صوبحی ئومێد**
**هەر لەداوێنی یەکێ صوبحا بەلەك پەنهانە ڕۆژ(١٨)**

بەم پێیە بەبۆچوونی مەحوی هاتن و چوونی شەو و ڕۆژ جۆرە گەڕانێکە بەشوێن دلبەردا ، کەواتە عەشق هەموو گەردوونی داگرتووە ، بەلآم لەو گەڕانەدا ڕۆژ بەو هەموو ڕووناکی خۆیەوە نەگەیشتە ئەنجام و شەو ئەم شەرەفەی پێ ڕەوا بینرا ، بۆیە دەبینین شەو دەبێتە ئۆقیانووسێکی مشت لەعەنبەر و ڕۆژیش لەداخاندا دەسووتێ و دەبێتە خۆڵەمێش :

**شەو نەبوو ، بەحری موحیطی عەنبەری بوو ناوی شەو**

**بـــوو بـــەنیسبەت ئەو شەوە ، خاکستەری گوڵخانە ڕۆژ**[١٩]

دوای ئەوەی بە کورتی لایەنی سۆفیگەری لەم غەزەلە دەستنیشانکرا ، ئێستاش وا بەچاك دەزانرێ کە زاراوەکانی سۆفیگەری لەم شیعرەدا نیشان بدرێن بۆ زیاتر پـشت ئەسـتوورکردنی بۆچـوونەکان ، ووشـەکان بـریتین لەمانـەی خـوارەوە (ئیحسان ، بەحر ، پەروانـە ، جیلـوە ، جانـان ، چـەوگان ، خـودا ، ذات ، ڕۆژ ، ڕۆح ، ساقی ، سوجدە ، شاه ، شەمع ، عیشق ، گەوهەر ، گوڵخان ، مەحەببـەت ، مەست ، میعراج ، نوور ، ویصال ، وەصل) ، لـەم (٢٣) زاراوەیـەدا تـەنیا یـەك زاراوەی حـاڵی بـەکارهێناوە کـە (مەحەببـەت) ەو زاراوەیـەکی مەقامیـشی بەکارهێناوە کە (ئیحسان) ە .

شەو :

شەو لای شاعیران بەگشتی نائومێدی و نایەتی (سلبی) دەگەیـەنێ ، بـەلآم لای مـەحوی شـکۆمەندی و ئایـەتی (ایجـابی) نیـشان دەدا ، چـەنکە ئـەو شـەوەی مـەحوی باسـی دەکـات شـەوی مـەرد و خۆشەویـستانی خوایـە و بەبۆچـوونی (شەبستەری)[٢٠] بریتییە لە (خـودی تـەنیا – خـوا) کـە لەبـەر بێڕەنگـی بەشـەو دەچوێنرێ چونکە لەشەوی تاریك شت لێك جـوێ ناکرێتـەوە و ڕۆشنیـشەکە بـە

خودی خۆی رووناکە و هەموو شتێ نوور لەو وەردەگرن ، بۆیە ئەو شەوەی شاعیر مەبەستێتی شەوی جیهانی جەبەڕووت و مرۆڤییە.

مەحوی بەشەوی جیهانی جەبەڕووت دەست پێدەکا ئەو شەوەی کە لەنێوان جیهانی هەستی و ناهەستی دایە ، دەبینین تاکە سوارەی ئەو شەوە پەروانەیە کەلەبەر عەشقی ڕاستەقینەی خۆی دەسوتێنێ ، پەروانەش لای عەریفان ئوستادی عەشقە :

**شەو کەسێ پرسیی لەخۆ دەرخستنی پەروانە شەو**
**ئەو وتی ، ناتێگەیشتوو! تەجربەی مەردانە شەو**[٢١]

مەحوی لەوە ئاگادارە کە شەو لەسەردەمی ئەودا بەسووکی سەیری دەکرا و هێمای ئازار و مەینەت بوو ، بەڵام ئەو شەوەی مەحوی بەپێچەوانەی ئەو شەوە زۆر پایە بەرز و نووری هیدایەتی عاشقانی خوای تێدا دەردەکەوێ و ئەگەر نەبێ ئەستێرەکان نابینرێن :

**هەرسیا بەختانی عیشقە مەزهەری نووری هودان**
**شەو نەبێ ئەستێرە مەستوورن ، بەکەم مەڕوانە شەو**[٢٢]

ئەمجارە شەو دەبێتە شەوی مرۆڤی و پەردەپۆشی گوناهکارانە ، سەرەڕای ئەمەش رۆژی مەحوی هێندە رەشە بۆیە خەڵکی ئاگایان لەگوناهی گوناهکاران نی یە ، ڕەشی ڕۆژەکەی مەحوی بۆ خۆی نایەتیە و بۆ غەیری خۆی ئاییەتیە ، بەڵام ڕەشی شەوەکە بۆ هەمووان ئاییەتیە :

**ئەم سیا ڕۆژی منە پۆشیوییە عەیبی کەسان**
**ئاشکارە سەتری ئەحواڵی گەنەهکارانە شەو**[٢٣]

هەر ئەم شەوی مرۆڤییەیە لەخزمەتی خۆشەویستانی خوایە نووریان ئاشکرابێ و ڕابەریی دەوروبەریان دەکەن ، کەواتە هەرچەندە شەو بەشێوە تاریکە بەڵام بۆ ئەهلی دڵان دەمی دەرکەوتنی نووریانە ، ئەم نوورەش لەو نورەوەیە کە لەکێوی توور تەجەللای کرد :

**بۆیە زوڵمەت پۆشە ، نووری ئەهلی جەوهەر دەرکــەوێ**

**ســەیری حەققی کەن لەسەر ئەم ماه و ئەستێرانە شەو**[٢٤]

شەو لای سۆفی زۆر مەزنە ، چونکە کاتی ڕاز و نیاز دەرخستنی دڵدار و دولبەرە و هاودەمی عاشقە و سەرەڕای ئەوەی کە پەردەپۆشیشە و وەك مەحرەمێ خۆی نیشان دەدا و ڕازگر و هاوردەی عاشقانە :

**نەبووە ، نابینی لەشەو مەحرەمترێ تا ڕۆژی حـــەشر**

**پــەردە پۆشە ، هەمدەمە ، هەمدەردی عوشتاقانە شەو**[٢٥]

شەو دڵدارە و بەشوێن ڕۆژی دولبەریدا وێڵە و هەر لەچـاوەڕانیی دەرکـەوتنێتی ، ئــەو عەشـقەی شــەو هەیــەتی ئەزەلییــە و بەدیارکــەوتنی ڕۆژی دولبــەری مــەحو دەبێتەوە لەبەر پێیدا :

**شەو هەموو شەو چاوەڕێیە ڕۆژ هەڵێ ، هەر ڕۆژهەڵات**

**مــــەحـــوە ســـەرتـــــــاپـا لـــەبەر پێیا فیداکارانە شەو**[٢٦]

مـەحوی تانـە لەعاشـقە فێڵبازەکـان دەدا و بـەخۆ پەرسـتیان دادەنــێ ، چـونکە لەعەشـقێکی ڕووکەشـیدان و سـەرکزییان بـۆ وەدەسـتهێنانی جیهـانی مادەیـە ، ئینجا ڕوونی دەکاتەوە کـە عاشـق دەبـێ خـۆ بـۆ مەعـشووقەکەی بـەخت بکـا و پەروانە ئاسا بسووتێ ، بۆیـە شـەو کـە دڵـداری ڕۆژە هــەر کـە دەرکـەوت خـۆی بەقوربان دەکا و بارگەی تێك دەنێ :

**خود پەرستینە ! لەشەو فێری پەرستن بن ، کە خۆر**
**هـەر دیـاری دا ، بـەدەوری سەریەدا قوربانە شەو(٢٧)**

ئـەمجارە مـەحوی خـۆی وەکـو شـەو دانـاوە و هـەردووکیان لـەداخی یاریـان دەروونیان ڕەشبووە ، کەواتە ڕەشیی شەو لەسووتانی عەشقەکەیەوە هـاتووە ، بەم جۆرە شاعیریش شەو ئاسا بەدوای دولبەریدا وێڵە و کەوەرێیە :

**فیرقــەتـی ڕۆژە دەروونــی کـــردە داغێکی ســیا**
**وەك منی سەودا زەدە ئاتەش زەدەی هیجرانە شەو(٢٨)**

لەم غەزەلەدا شەو دڵدارە و ڕۆژ دولبـەرە ، تـاریکی شـەو نیـشانەی سووتانێتی لەعەشقدا ، هەر ئەم تاریکیەیە کە دەبێـتە هۆی پەیدابوونی ڕووناکی ڕۆژ ، لـەم ڕوانگەیـەوە شـەو لای مـەحوی فـەزڵی بەسـەر ڕۆژدا هەیـە ، چـونکە لـەداوێنی ئەوەوە ڕۆژ دەردێ ، دوور نییە مەبەستی شاعیر لە (تیرەگی) پێش ئەفراندن بێ ، جا لەم تیرەگەیەوە ڕووناکی ڕۆژ دەرکەوتووە :

**تیرەگــی وا فـــەزڵــی بـــۆ نادەم بەسەر ڕووناکیا**
**مەنشەئی ئیزهاری جیلوەی فەیزی سبحەینانە شەو(٢٩)**

لەمەوبەر شەو وەکو عاشقی ڕۆژ خۆی دەردەخست ، لێرە بەدواوە دەگەڕێتـەوە سـەر بنەچـەی خـۆی و وەکـو شـەوێکی مرۆڤـی خـۆی نیشان دەدا و ئـەودەم و کاتەیـە کـە عاشـقانی خـوا ڕاز و نهێنـی خۆیـانی تێدا نیـشان دەدەن ، چـونکە عەشقی خوایی نهێنیەکە و نابێ دەربخرێ ، هەر وەکو بابا تاهیری هەمەدانی لەم ڕووەوە دەڵێ :

**نەمیدانم کـــە ڕازم واکی واژەم ؟**
**غەمی سۆز و گـودازم واکی واژەم ؟**
**چ واژەم هەرکی زوونە بنگرەفـاش**
**دیگەر ڕازونیازم واکـــــــی واژەم؟(٣٠)**

کەواتە ئەهلی نیاز بەشەو گرێی دڵی خۆیان دەکەنەوە و رێیان پێ دەدرێ ، چونکە شەو پەردەیەکە لەنێوان چاوی سەر و بینینی ئەو حاڵەتانەی کە لەژوانی عاشقانی ڕاستی ڕوودەدا ، لەم بارەیەوە مەحوی دەڵێ :

**هەر لەتاریکیی شەوایە ڕێ درێ ئەهلی نیاز**
**ڕازی دڵ ئیفشا بکەن ، خەڵوەتگەهی خاصانە شەو**(٣١)

شەو کانگای ڕاز و نیازە ، شەو ڕۆیینی پێغەمبەر (د.خ) قەدر و بەرات هەر لەشەودا بووە ، بەلای مەحوی میعراج گەیشتنی دڵدارە بەدولبەر لەشەودا (ثم دنا فتدلی فکان قاب قوسین أو أدنی)(٣٢) ، بەم پێیە دەبینین شەو لەم غەزەلەدا دوو ڕۆڵی گرنگی هەیە ، یەکەم دڵدارە و بەدوای خۆری دولبەریدا عەودالە ، دووەم کاتێکی پیرۆزە و سەرچاوەی ڕاز و نهێنییەکانە لە ئەزەلدا ، چونکە بوونەوەر لەسەرەتادا تاریك بووە و دوایی جودا بوونەتەوە :

**هێندە صاحێب سیرە ، (میعراج) شەوی (قەدر) و (بەرات)**
**خاصەجاتی ئەون و مومتازە بەم ئەسرارانە شەو**(٣٣)

شەو هەندە پایەبەرزە لای مەحوی کە دەیکاتە دەریایەکی مشت لەدوڕی خواناسین ، بەڵام ئەو دەریایەی کە مەترسی خنکانی لێ ناکرێ ، چونکە ئەوەی مەلەوان نەبێ زاتی ئەوە ناکات خۆی هەڵداتە ناویەوە ، لێرەدا ئەم دوڕ و دەریایە بۆ سەرەتای خولقاندنی گەردوون دەگەڕێتەوە ، کە هەر خوا هەبووە و نەناسراوە ، هەر وەك لە حەدیسی قودسیدا هاتووە (کنت کنزاً مخفیاً فخلقت الخلق کی أعرف)(٣٤) بەم پێیە شەو دەمکاتی وەدەستهێنانی ئەم مرواری ناسینەیە :

**هەرکەسێ طالیب بەدوڕڕی مەعریفەت کۆکردنە**

**پــڕ لەدوڕ دەریایەکی بێ مەهلەکەی خنکانە شەو**[٣٥]

ئێستاش دوای لێکدانــەوەی غەزەلەکــە لــە ڕوانگــەی سۆفیگەرییەوە ، وا بەچاك دەزانــرێ زاراوەکــانی ســۆفیگەری دەستنیــشان بکــرێن بــۆ دەوڵەمەنــدکردنی غەزەلەکەی لەلایەنی عیرفانیەوە ، زاراوەکانیش ئەمانەنە (ئاتەش ، ئاوی حەیات ، ئەحوالٚ ، پەروانە ، جان ، جیلوە ، جەوهــەر ، حــەق ، خــضر ، خەڵوەتگــەه ، خــودا ، داغ ، دڵ ، دەریــا ، دەروون ، دوڕ ، ڕاز ، ڕۆژ ، ســەودا ، ســیڕ ، شــەو ، زولمەت ، عیشق ، عوشاق ، فــەیز ، فــیراق ، فیرقــەت ، مــەحرەم ، مەعریفــەت ، مەحوو ، میعراج ، نوور ، هیجران).

# بەشی دووەم

## بەرامبەریکردنی هەردوو غەزەلەکەی مەحوی و حەمدی :

حەمــدی لەچــینی ســێیەمی شــاعیرانی قوتابخانــەی بابانــە و خــاوەن شــێوازێکی چڕوپڕە و لە داڕشتنە هونەرییەکانیدا هاوتای کەمە ، بەڵام نابێ ئەمــە پــشتگوێ بخەین کە هەموو شاعیرێ کەم تا زۆری کاریگەریی شاعیرانی تری بەسەرەوەیە ، حەمدیش وەکو ئــەو شــاعیرانە بە (کــوردی و نــالی و مــەحوی) کاریگــەر بــووە و ئەمەش لەچوارینەیەکدا ئاماژە پێکردووە و وای بۆ چووە کــە مــەحوی خــەرمانی شیعری کوردی تالاندووە و دەیەکەکی داوەتە حەمدی وەك دەڵێ :

**خـــەرمانی لەفزی کوردی ، کوردی کە کردی پێوان**

**نـــالی کـــە نـــالّی کـــــــاسەیەکی دا بەئەو لێوان**

**تـــاراجـی کـــرد کە مەحوییەفەندی بەلوتفی خۆی**

**عــوشریشی دا بــە (حــەمــدی) وتی بیبەرە دیوان**[٣٦]

جگە لەم چوارینەیە حەمدی پێنج خشتەکییەکی لەسەر غەزەلێکی مەحوی نووسیوە و[٣٧] ئەمەش بەلگەیەکی ترە کە حەمدی یەکێکە لەقوتابییە بلیمەتەکانی قوتابخانەی شیعری مەحوی.

لەپێداچوونەوەیەکی ئاسایی دیوانی حەمدی دەرکەوت کە لەدوو غەزەلی (شەو و ڕۆژ) و پێنج شوێنی تر کارتێکردنی مەحویان پێوە دیارە ، بەلام تەوەرەی لێکۆلینەوەکە تەنیا هەردوو غەزەلی (شەو و ڕۆژ) دەگرێتەوە ، ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەرەتایەکە بۆ لێکۆلینەوەی تر لە ئایندەدا گەر خوا یار بێت.

**ڕۆژ :**

گەر بەوردی سەیری هەردوو غەزەلی مەحوی و حەمدی بکرێ دیاردەکەوێ کە هەردووکیان ستایشی ڕۆژ دەکەن و مەزنیەکەی دەستنیشان دەکەن ، هەروەها ئاشکرادەبێ کە غەزەلەکەی حەمدی کاریگەری غەزەلەکەی مەحوی پێوەیە لە دوو لایەنەوە :

١. **لایەنی ڕوخسار :**

أ – هەردوو غەزەلەکەی لەسەر عەرووزی عەرەبین و لەبەحری ڕەمەلی هەشت هەنگاویی مەقسوورن.

ب – دوا سەروایان (ڕۆژ) ە و پێش سەروایان مۆرفیمی (انه).

٢. **لایەنی ناوەڕۆك :**

حەمدی و مەحوی لە شیعرەکانیاندا بەدوای یارێکەوە وێلن و بەرەبەرە ئەوینەکەیان بەرەو قولایی دەچێت و لەناکاو بەرەو خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) دەگوازرێتەوە.

یارەکەی حەمدی خۆشەویستێکێتی کە لەشاری (کوێت) بەند بووە ، بەلام خۆشەویستەکەی مەحوی پێغەمبەرە (د.خ) ، ئەوەی زیاتر کاریگەریەکەی دەسەلمێنێ ئەوەیە کە مەحوی ئەو غەزەلەی کە لەسەر (ڕۆژ) ە وەك بلێی دوو

پارچەیە و لەپارچەی یەکەمدا ڕۆژ عاشقە و پێغەمبەر (د.خ) مەعشووقە ، دوای ئەم پارچەیە دێتە سەر شەوی میعراج ، حەمدیش بەهەمان شێوە غەزەلەکەی دوو بەشە و بەشی یەکەمی لەسەر خۆشەویستە بەندکراوەکەی کوێتە و ئەویتری باسی میعراجە . بەم پێیە هەردوو پارچەکەی مەحوی لەچوارچێوەی عەشقێکی سۆفیانە دایە و ئەوەی حەمدی پارچەی دووەمی سەر بەشیعری ئاینییە . ئێستاش وا ئاماژە بەلایەنە لێکچووەکانیان دەکرێ بەنموونەی شیعرییەوە :

حەمدی :

من لەپێکەوتم لەدووی ئەو ماهە جانۆبەی ئەوە
کائیناتی پشکنیوە ، وێڵ و سەرگەردانە ڕۆژ(٣٨)

مەحوی :

ئەڵبەتە مەجنوونی ڕۆژی ڕوومەتی لەیلایەکە
موتتەصیل شام و سەحەر ، کەوتۆتە ئەم شاخانە ڕۆژ(٣٩)

ئەو ڕۆژەی حەمدی باسی دەکا ، ڕۆژێکی ئامادەیە چونکە شاعیر و ڕۆژ هەردووکیان بەدوای یاردا وێڵن ، بەڵام ڕۆژەکەی مەحوی ڕۆژێکی ئامادە و ئەزەلییە چونکە تەنیا ڕۆژ عاشقە و بەدوای یاردا کەوەڕێیە.

لەهەردوو بەیتەکەدا ڕۆژ بەدوای بینینی یاردا وێڵە و لەگەڕانیدا بەو کێوانەوە شەکەت بووە و گەردوونی پشکنیوە ، جا دەبێ ئەو لەیلایە کێ بێ کە ڕۆژ کەوتۆتە ئەوینیەوە ؟ بەپێی بەیتەکانی دوایی ئەو لەیلایە پێغەمبەرە (د.خ) کە خودان پەرچووی میعراجە.

حەمدی :

گەر بەئومێدی ویصالی شامی زوڵفی تۆ نەبی
سەر لەکەل دەرنایەنێ هەر نایەوێ ئەو مانە ڕۆژ(٤٠)

مەحوی :

**ڕووتی دی لەو ڕۆژەوە گەر ڕۆژە سەرگەردانە ڕۆژ**

**گـەییە ئێوارە ، وەکو من ، ئیشی قوڕ پێوانە ڕۆژ[٤١]**

حەمدی لە ڕۆژی ئامادە دایە ، بەڵام مەحوی لـەڕۆژی ئـەزەل دایـە و کـەمێکیش بەرەو ڕۆژی ئامادە هەنگاو دەنێ ، هەردوو بەیتەکـە باسـی جـوانی ڕووی یـارێ دەکەن کە ڕۆژیش گیرۆدەی ئەو جوانییە بووە و لەداخاندا خەریکی قوڕپێوانە و گەر لەبەر بینینی ڕووی ئەو یارە نەبێ جارێکیتر سەر دەرناهێنێ.

حەمدی :

**ئەو شەوی میعراجە فەخری ئەنبیا دەعوەت کرا**

**تاقـــە نانێ بوو خرایە سەردەمی ئەوخوانە ڕۆژ[٤٢]**

مەحوی :

**شـــەو شەوی میعراجی شاهی ئەنبیا بێ ، وادەبێ**

**بیپەرستێ ، بەڵکی سوجدەی بۆ ببا هەر ئانە ڕۆژ[٤٣]**

حەمدی و مەحوی هەردووکیان لەشەوی گومبوو دان و یادی میعراج دەکەنەوە ، ئـەو شـەوەی کـە (محەمـەد)(د.خ) بـۆ ئاسمـان دەعـوەت کرایـە سـەر سـفرەی خوایی. داهێنانی حەمدی لەوەدایە کە ڕۆژی کردۆتە نان و لەسەر ئەو سفرەیەی داناوە، لێکچوونەکەش لەبـەر خـڕی و زەردی و گـەرمییـە ، هەرچـەندە حەمـدی وەکو مەحوی باسی کڕنۆشی ڕۆژی نەکردووە ، بەڵام لەژێرەوە دانانی ڕۆژ وەکو نانێ لەسەر سفرە جۆرە کڕنۆشی دەگەیەنێ کـە لەسـەر ڕوو بکـەوێ ، ئەوکاتـە سفرەکە دەبێـتە بەرماڵ.

حەمدی :

**ئـەو شـــەوە ئەو ئیحترامە تا حەشر نابێتەوە**

**گەر دەگیرێ بیکەنە قوربانی ئەو قوربانە ڕۆژ[٤٤]**

مەحوی :

من فیدای ئەو زاتە بم ، بەو ، شەوە بوو بەم شەوە
تــا قیامــەت هەر حەسەد با بەو شکۆە و شانە ڕۆژ[٤٥]

هەردووکیان باسی پلە و پایەی ئەو شەوە مەزنە دەکەن و ئێرەیی پێ دەبەن و ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ڕۆژیش ئێرەیی بەو شەوە دەبا ، حەمدی زیاتر لەگەورەیی ئەو شەوە دەکۆڵێتەوە و داوای ئەوە دەکا گەر ڕۆژ بگیرێ ئەوا بیکەنە قوربانیی ئەو شەوە ، جالێرە وشەی قوربانی نزیکبوونەوەش دەگرێتەوە کە لە (قرب) ەوە هاتووە.

شەو :

هەروەها لەهەردوو غەزەلەکەی مەحوی و حەمدی کە لەسەر شەویان نووسیوە لێکچوون بەدی دەکرێ و بەگشتی هەردووکیان باسی شکۆمەندیی شەو دەکەن و فەزڵی بەسەر ڕۆژدا دەدەن ، لەبەر ئەوەی نهێنیەکانی خۆشەویستی هەر لەشەودا بەدیار دەکەوێ ، سەرەڕای ئەمەش بەرات و شەوی قەدر و میعراج هەر لەشەودا ڕوویان داوە و یاد دەکرێنەوە.

سەرەڕای واتای گشتی غەزەلەکان لەشێوە و ڕوخساریشدا پێك دەچن و هەردووکیان لەسەر بەحری عەرووزیی ڕەمەلی هەشت هەنگاوی مەقسوورن و دوا سەروایان وشەی (شەو) ە و پێش سەروایان بە (انە) کۆتایی هاتووە ، بەڵام لەڕووی واتاوە جگە لەوێکچوونی واتا گشتییەکەی هەست دەکرێ کە ئەم بەیتانەی خوارەوەی حەمدی کاریگەری بەیتەکانی مەحوییان پێوە دیارە :

حەمدی :

کــردەوەی دنیا کــە هەر عەیبە ئەبێ داپۆشرێ
پەردەیێکی موختەصەر خاصی بەسەر دادانە شەو[٤٦]

مەحوی :

ئــەم سیاپۆزیی منە پۆشیویە عەیبی کەسان
ئاشکارە سەتری ئـەحوالّی گونەهکارانە شەو[٤٧]

هەردوو شەوەکان لەخانەی شەوی مرۆڤـی دان و کـاتێ باسـی جیهـانی هەسـتی دەکەن ، حەمدی و مەحوی لەوە دەدوێن کە شەو تاوانی گوناهباران دادەپۆشێ ، لەلای حەمدی پەردەیەکی بەسەرادەدا ، بەڵام مـەحوی زیـاتر قـوڵ بۆتـەوە و ڕەشیی شەو بەجوانی و ڕەسەنی دادەنێ چونکە بۆتە پەردەیـەك و تاوانبـارانی لێوە دیار نابێـت ، ئەم سیفەتی شەوە ئاماژەیە بەم ئایەتە پیرۆزە (وجعلنا الیل لباساً)[٤٨]

لێرەدا (لباس) جۆرە داپۆشینێکە .

حەمدی :

بێ سەرو سامان عەجەب دەریایەکی قەترانە شەو
ڕۆژی ڕەشبێ دۆزەخێکی مــــــودەتی هیجرانە شەو[٤٩]

مەحوی :

فــیرقــەتـــی ڕۆژە دەروونی کـــردە داغێکی ســـیا
وەك منی سەودا زەدە ئاتەش زەدەی هیجرانە شەو[٥٠]

هــەردوو شـاعیر لەباسـکردنی شــەوی مرۆڤــی دان ، لەهــەردوو بەیتەکـەدا شــەو لـەداخی دوورکەوتنـەوەی یـاری ڕەش هەڵگـەڕاوە و یارەکـەش یـا ڕۆژە یـا ڕۆژ ئاسایە لەجوانیدا ، حەمدی هەر تەنیا ناوەڕۆکەکەی دووبارە نەکردۆتەوە بـەڵکو لەروخساریش پێی کاریگەرە و هەمان سەروا وپێش سەروای ئەوەی هێناوەتەوە کە (هیجرانە شەو) ە ، مەحوی هەنگاوێ لەحەمـدی زیـاتر ڕۆیـشتووە و وشـەی بەخۆی چواندووە کە لەداخی یاری ئاگری دووری سوتاندوێتی.

حەمدی :

هـــــەر شەوی میعراجە تەنیا کائیناتە قیمەتی

(لیلە القدر) ی موقابیل صەد هەزار ڕۆژانە شەو[٥١]

مەحوی :

هێندە صاحێب سیڕڕە (میعراج) و شەوی (قەدر) و (بەرات)

خـــاصــە جـــاتــی ئــــەون و، مومتازە بەم ئەسرارانە شەو[٥٢]

دیسان شەوەکان مرۆڤین ، هـەردووکیان باسـی ئـەو ڕاز و نهێنیانـە دەکـەن کـە لەشەوی قەدر و میعراجدا پەیدا بوونە ، هەردوو بەیتـەکان لـە ئاسـتی هونەریـدا وەکو یەکن و هەر هێندە حەمدی بیرۆکەکەی لە مەحوی وەرگرتووە.

حەمدی :

حـــەمدی لادە لەم حیسابە کافییە بۆ تێگەیوو

چونکە ڕۆژی ڕۆشنی ئەهلی دڵ و ڕەندانە شەو[٥٣]

مەحوی :

شەو کەسێ پرسی لەخۆ دەرخستنی پەروانە شەو

ئــەو وتی : ناتێگەیشتوو تەجربەی مەردانە شەو[٥٤]

ئەمجارە شەوەکان شەوی جەبەڕووتن و لەسنووری نێوان جیهـانی هەسـتی ونـا هەستی دان ، هەردووکیان لەوە دەدوێن کەوا مرۆڤی دانا تێدەگا کە شەو کـاتی تاقیکردنەوەی مەردانی خوایـە و لەشـەودا خـۆ دەردەخـەن وەکـو پـەروانـە کـە لەپێناوی عەشقدا خۆی دەسوتێنێ.

هەرچەندە بەیتەکەی حەمدی ئاستی هونەریی نزم نییە ، بـەڵام هێـشتا ناگاتـە مـەحوی کـە زۆر شـاعیرانە دایـەلۆگێکی لـە نێـوان دوو کەسـی دانـا و نـادان دروستکردووە لەبارەی خۆ دەرخستنی پەروانە لە شەودا.

# ئـــــــەنجـام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا توانرا ئەم ئەنجامانە بەدەست بهێنرێ :

١) سروشتی ڕۆژ لای مەحوی گۆڕاوە لە دولبەرەوە بۆ دڵدار.

٢) هەروەها سروشتی مانگیش گۆڕاوە و ڕۆژ لەدەوری دێت ە دەچێ.

٣) یار لای مەحوی پێغەمبەرە و لای حەمدی برادەرێکێتی.

٤) عەشق لای مەحوی هەموو گەردوونی داگرتووە.

٥) شەو لای مەحوی شکۆمەندی و ئایەتی دەگەیەنێ.

٦) مەحوی و حەمدی باسی هەردوو شەوی مرۆڤی و جەبەڕووتیان کردووە.

٧) حەمدی کاریگەریی مەحویی پێوە دیارە لەهەردوو غەزەلی شەو و ڕۆژدا و کاریگەرییەکەش لەناوەڕۆك و روخسار دایە.

٨) هەردوو غەزەلەکەی مەحوی سۆفیانەن و پارچەی دووەمی شیعرەکەی حەمدی ئاینییە.

٩) هەردووکیان باسی ڕۆژی ئامادە و گومبوو دەکەن بەڵام مەحوی ئەزەلیشی بۆ زیاد کردووە.

# پـــــەراوێـــزەكــــــان :

١. ناوی مەلا محەمەدی كوڕی مەلا عوسمانی باڵخییە و لە دەوروبەری (١٨٣٦) لە دایكبووە ، باوكی خەلیفەی شێخ عوسمانی سیراجودینی تەوێڵە بووە و لای ئەو خوێندویتی و چووەتە سنە و سابلاخ بۆ خوێندن و لای موفتی زەهاوی لەبەغدا ئیجازەی وەرگرتووە.

لە (١٨٦٢) بووەتە ئەندامی دادگا لە سلێمانی ، لە (١٨٨٣) چووەتە حەج و لەوێوە بەرە و ئەستەمبۆڵ ڕۆیشتووە و چاوی بە سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی كەوتووە و ڕێزی لێناوە و لەسلێمانی خانەقایەكی بۆ بنیات ناوە ، لە (١٩٠٦) وەفاتیكردووە و لەخانەقایەكەی نێژراوە ، (دیوانی مەحوی ، مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس ، ل ٥-٧)

٢. ناوی ئەحمەد بەگی كوڕی فەتاح بەگی ساحێبقرانە و لە (١٨٧٨) لە سلێمانی لەدایكبووە ، لەقوتابخانەی سەرەتایی ڕۆشدییەی عەسكەری و لە مزگەوتەكانی سلێمانی خوێندویتی ، نازناوی شیعری (حەمدی) بووە و هەر لە منداڵییەوە حەزی لە شیعر كردووە و مستەفا بەگ كوری مامی بووە و سالم ئامۆزای باوكی بووە . لە بزووتنەوەكەی شێخ مەحموودا ئازاری دیوە و هەموو سامانی لەو پێناوەدا خەرجكردووە و مرۆڤێكی بەهەڵوێست بووە . لە (١٩٣٦) وەفاتی كردووە و لەگردی سەیوان نێژراوە.

٣. فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ، ص٤٣١ – ٤٣٢.

٤. عزف علی وتر النص الشعری ،ص٢٩.

٥. فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی ، ص٤٩٧.

٦. دیوانی مەحوی ، ل١٣٧.

٧. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٧.

٨. كليات سعدى ، محمد على فروغى ، ص٦٨.
٩. دیوانی مەحوی ، ل١٣٧.
١٠. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٨.
١١. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٨.
١٢. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٨.
١٣. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٩.
١٤. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٩.
١٥. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٩.
١٦. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٩.
١٧. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٤٠.
١٨. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٤٠.
١٩. سەرچاوەی پێشوو ، ل١٤١.
٢٠. ناوی مەحمودی کوڕی عەبدولکەریمی شەبستەرییە لە (٦٧٨ك ، ١٢٨٨ع) لە ئازربایجان لەدایکبووە و لە (٧٢٠ك ، ١٣٢٠ع) وەفاتی کردووە خاوەنی دیوانی (گلشن راز) ەو لەبارەی ڕێبازی یەکێتی بوونە ، گلشن راز ، شێخ مەحمود شبستری ، چاپ اول سنندج (١٣٦٩) هـ،ش،ص٤ – ٦.
٢١. دیوانی مەحوی ،ل٢٥٦.
٢٢. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٧.
٢٣. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٧.
٢٤. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٧.
٢٥. دیوانی مەحوی ، ل٢٥٨.
٢٦. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٨.
٢٧. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٨.
٢٨. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٨.
٢٩. سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٥٩.
٣٠. دیوانی بابا تاهیری عوریان ، ل١٧.
٣١. دیوانی مەحوی ، ل٢٥٩.
٣٢. النجم / ٨.
٣٣. دیوانی مەحوی ،ل٢٥٩.
٣٤. الكشف الالهى ، محمد الطرابلسي ، مكتبة الطالب الجامعى ، مكة المكرمة ، (١٩٨٧) ، ص٥٧٤.
٣٥. دیوانی مەحوی ، ل٢٦٠.
٣٦. دیوانی حەمدی ، جەمال محەمەد محەمەدەمین ، ل١٦٩.
٣٧. دیوانی حەمدی ، ل٧٤.

٣٨.دیوانی مەحوی ، ل١٣٨.
٣٩.دیوانی مەحوی ، ل٧٥.
٤٠. دیوانی مەحوی ، ل١٣٧.
٤١. دیوانی مەحوی ، ل٧٦.
٤٢. دیوانی مەحوی ، ل١٤٠.
٤٣. دیوانی مەحوی ، ل٧٦.
٤٤. دیوانی مەحوی ، ل١٤١.
٤٥. دیوانی حەمدی ، ل٧٧.
٤٦. دیوانی مەحوی ، ل٢٥٧.
٤٧. النبأ / ١٠.
٤٨. دیوانی مەحوی ، ل٧٧.
٤٩. دیوانی مەحوی ، ل٢٥٨.
٥٠. دیوانی مەحوی ، ل٧٧.
٥١. دیوانی مەحوی ، ل٢٥٩.
٥٢. دیوانی مەحوی ، ل٧٨.
٥٣. دیـــوانی مـــەحوی ، ل٢٥٨
٥٤. .

# سەرچاوەکان

**کوردییەکان :**

١) دیوانی بابا تاهیری عوریان ، کیتابفرۆشی ڕەجەبی ، تەهران.

٢) دیوانی حەمدی ، چ١ ، جەمال محەمەد محەمەد ئەمین ، چاپخانەی ئۆفێستی سەرکەوتن ، سلێمانی ، (١٩٨٤).

٣) دیوانی مەحوی ، چ٢ ، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ، چاپخانەی ئۆفێستی حیسام ، بەغدا (١٩٨٤).

**فارسییەکان :**

٤) فرهنگ اصطلاحات تعبيرات عرفانی ، چاپ چهارم ،د.سيد جعفر سجادی ، چاپ افست گلشن ، تهران ، (١٣٧٨).

٥) كليات سعدی ، محمد علی فروغی ، انتشارات نشر طلوع.

٦) گلشن راز ، چاپ اول ، شێخ محمود شبستری ، سنندج (١٣٦٩) هـ. ش .

**عەرەبییەکان :**

٧) عزف على وتر النص الشعری ، د.عمر محمد طالب ، دمشق ،٢٠٠٠.

٨) الكشف الالهی ، محمد بن محمد الطرابلسی ، مكتبة الطالب الجامعی ، مكة المكرمة ،(١٨٩٧).

فەلەک هەرگا کەسێکی هەڵبڕێ، وەقتی هیلاکەتیە

کە سەر بۆ کەینە پەت بێ، پێ لە کورسی و ئەسکەمەل چبکا؟!

لە هەر جێیەک هەڵێ خۆرشیدی عیشقی گوڵ روخان (مەحوی)

ئەگەر عەقڵی بێ، لەو جێگە ئاونگی عەقڵ چبکا؟!



چاپخانەی منارە - هەولێر